هەولێر ١٩٨٣

# کاروان


ژ 6

ئـــاداری 1983

گۆڤارێکی رۆشنبیری‌ی مانگانەیە

ئەمینداریێتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان

بەزمانی کوردی‌و عەرەبی دەری دەکا


## ■ لـەم ژمـارەیەدا ■






ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمینداریێتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ـ ت : 20882

لێکۆڵینەوە

د. کەمال مەزهەر

# ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەورووپای رۆژگاری «رێنیسانس»دا

– بەشی سێیەم –

## ئێرازمۆسی ڕۆتەردامیو « ستایشی گەران »

لە سەرتاپای ئەورووپای ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا کەم زانای ئەوتۆ هەلکەتووە بتوانێ شان لە شانی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی بدات(1) ، یا بە ڕادەی ئەو کار بکاتە سەر ژیانی ڕووناکبیری ئەوسای زۆربەی ولاتانی ئەورووپا .

تاوەکو ئێستە بەتەواوەتی ڕۆژو سالی لەدایك بوونی ئێرازمۆس ساغنەبۆتەوە . بەپێی هەندێك لێکدانەوە دەبێ ڕۆژی 28ی مانگی تەشرینی یەکەمی سالی 1466 لە شاری ڕۆتەردامی هۆلەندە چاوی هەلهێنابێ . سەرچاوەش هەیە 1469 بە سالی لەدایكبوونی دادەنێ .

ئێرازمۆس لەبەرئەوەی بە هەتیوی گەورە بوو(2) لە زوویەکەوە ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر یەکێك لە ڕەبەنگەکانی کلێسە(3) ، لەوێ بناغەی خوێندنو فێربوونی بۆ خۆی دارشت ، هەرچەندە بە دل حەزی لە خوێندنی فێرگەیەکی سەربەخۆ دەکرد . لەو سەردەمەی ژیانیدا کەمێك مەیلی وێنەکێشیی هەبوو، دوای ئەوەیش بە ماوەیەك لای مامۆستایەکی ناسراو شتێك مۆسیقا فێربوو ، هەر لەوساشەوە شەقلی زیرەکیو وریاییو ئارەزووی بێئەندازەی خوێندنەوەی پێوە دیاری دا .

زوو خولیای خوێندنی بەرزو گەڕانو هاتوچۆ دای لە کەلەی ئێرازمۆس . سالی 1495 هۆلەندەی نیشتمانی بەجێهێشتو ڕووی کردە پاریسی فەرەنسە . لەوێش بە چوار سال بەشی تیۆلوجیی(4) زانکۆی پاریسی بڕیو زۆری نەبرد بووە ڕابەری « کۆلێج دی فرانس »ی بەناو بانگ . دوای ئەوە کەوتە گەڕان بە ولاتانی ناوەندو ڕۆژئاوای ئەورووپادا. نیشتمانی خۆی دەپەرست ، بەلام ولاتانی تریشی زۆر خۆش



**پیترارك**

دەویست . کە کاربەدەستانی زوێریختکایان لێ کرد شارەکەیان گەورە بکاتو لەوێ بەیەکجاری نیشتەجێ بێ بەدەم سوپاسێکی گەرموگوڕەوە تێیگەیاندن ئارەزووی لەوەیە ببێتە هاونیشتمانی هەموانو باوەش بەسەرانسەری جیهاندا بکات .

لەبەرئەوە ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی تاوەکو گوڕی بێ ما بەدەگمەن تا سەر لە یەك وڵاتو لە یەك شارو لە یەك شوێن دەژیا . دوای هۆڵەندەو فەرەنسە شەش ساڵی ڕەبەقی لە کەمبریج ئۆکسفۆردی بەناو بانگی ئینگیلتەرە بردەسەر ، چەند ساڵێکیش لە ئەڵەمانیاو ئیتالیا ژیاو لە ساڵی 1513وە سویسرەی کردە مەڵبەندی خۆی . دوای ئەوەی پیری ڕووی تێ کردو گوڕی‌لێ‌بڕی ناچار دوا پازدە ساڵی ژیانی بەتەواوەتی لە شاری بازلی سویسرە(5) نیشتەجێ بوو ، ئیتر زۆر بەدەگمەن ئەو شارەی بەجێ‌دەهێشت تا ڕۆژی دوازدەی مانگی تەمموزی ساڵی 1536 لەوێ گیانی سپارد .

لە نەفامانو حەسوودان بەولاوە یەکێك نەبوو ئێرازمۆسی ڕۆتەردامیی بە دڵ خۆش‌نەوێت . زاناو ڕووناکبیرە کەڵەکانی سەرانسەری ئەورووپای ڕۆژگاری خۆی شانازی‌یان بە هاوڕێیەتی یا شاگردێتی ئێرازمۆسەوە دەکرد . بو خۆیشی ڕووخۆشو دڵسۆزو دڵ‌فراوانو دەست‌کراوەو قسەلەڕوو ، دوژمنی باوەکوشتەی درۆزنو قسەبەرو زمان‌درێژو خۆهەڵکێشو نەزان ، ڕازێنەوەی کۆڕو کۆلی سەردەستەی مەجلیسانو دەمڕاستی هەموان بوو . بەکورتی زانایەکی پیاوو پیاوێکی زانا بوو .

بە شایەتی هەموان خامە ڕەنگینی وەك ئێرازمۆس لە ژیاندا کەم هەڵکەوتووە . نووسینەکانی تیغ‌بڕو نیشان‌پێكو هەست‌بزوێنو ناسكو ڕازاوەن . بە ڕەوانی یاریی بە وشەو ڕستەو ، نوێکاریی لە نووسیندا دەکرد . گەلێك زمانی دەزانیو زمانی لاتینیشی وەك زمانی زگماك دەزانیو خۆی فێری گریکیش کرد ، ئەو وردەکاری‌یەی ئێرازمۆس لە فۆنەتیکی زمانی گریکیدا کردی بۆی بووە شێوازو لە مەیدانی زانستدا بە شیلوی خۆی چەسپاند .

ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی لە نووسینەکانیدا جگە لە ناوی خۆی دوو نازناوی ئەدەبیشی بەکاردەهێنا ، یەکەمیان دیزیدێریۆس‌و(6) دووەمیان جێرهارد جێرهاردز ( لە هەندێك زماندا گێرهارد گێرهاردز ) بوو(7) .

بێ‌گومان زانایەکی وا دانا دەبوو دروستو ورد لە ئەرکەکانی قۆناغ تێ‌بگات . لەوەیش زیاتر ، زانای ئەوتۆ هەن دەڵێن جیهانی پڕکێشەو ئەندیشەی ئیمڕۆکەشمان بەڕادەی ئەوسای ئەورووپا پێویستی بە پەندە وردەکانی ئێرازمۆسە(8) .

بیروڕای مرۆپەروەرانەی(9) باوی ڕۆژگاری ڕێنیسانس لە چەند بەرهەمێکی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامیدا بە ڕوونی خۆی نواندووە ، وەك کتێبی « ڕابەری جەنگی عیسایی »(10) کە ساڵی 1501 تەواوی‌کردو کتێبی « دژی بەربەران »(11) کە دوای ئەو بە نزیکەی 20 ساڵ لە دانانی بۆوەو زۆر بەرز ئەدەبی کلاسیکی تێدا نرخاند . لەو نووسینانەیدا ئێرازمۆس هەوڵی‌داوە نیشانی‌بدات نهێنی‌یەکانی ئایینی عیسایی لەسەروو ڕادەو توانای تێگەیشتنی مرۆوەن . هەمان‌کات ئەو لە قوژبنی ئاڵوگۆڕو بەرەوپێش‌چوونی مرۆڤو دەسکەوتەکانی‌یەوە سەیری ئایینی عیسایی دەکرد .

ئێرازمۆس باوەڕی بە ئاڵوگۆڕو بەرەوپێش‌چوون زۆر هەبوو ، لەوقوژبنەوە سەیری دیاردە گرنگەکانی ڕۆژگاری خۆی دەکردو دەیگوت « زانست دەژێتەوەو جیهان دەگەڕێتەوە سەر ڕێگەی ڕاستی هۆش‌و ئەدەبی باڵاش دیسان دەگەشێتەوە » . بەڵام شان‌بەشانی ئەوەش ئێرازمۆس پێی‌وابوو خوو ڕەوشتی مرۆڤو ئارەزووی پتر لە سروشت هێزی بزوێنی ژیانو ڕەوڕەوەی مێژوون . لەگەڵ ئەوەشدا ئێرازمۆس شوێنو جێگەی تایبەتیی سروشتی بەتەواوەتی لەیادنەکردووەو جاروبار لە نووسینەکانیدا بە پیاهەڵدانێکی زۆرەوە باسی‌دەکات ، ژیانو هونەرو زانست لە بەرەوبوومی دوورناخاتەوە .

سەرنجەکانی ئێرازمۆس دەربارەی دەسەڵاتی میرو دامودەزگای میری لەو بەرهەمەیدا ڕەنگیان داوەتەوە کە ساڵی 1516 بە ناوی « پەروەردە ( یا فێرکردنی ) میری عیسایی»ەوە بڵاوی‌کردەوە(12) . ماکی ئەو سەرنجانەی لە دەوری ئەو بیرەی دەسووڕێنەوە کە لە قوژبنی ئەوەوە دەیڕوانی‌یە بڕبڕەی دامەزراندنی دامودەزگای میری ـ یاسای ژیانو بەرژەوەندی‌یەکانی کە پێی‌وابوو پلەیان گەلێك لەژووررووی تاکو تایبەتی‌یەوەیە . هەرچەندە ئەم لێکدانەوەیە بۆ ڕۆژگاری خۆی بۆچوونێکی ورد بوو ، بەڵام ئێرازمۆس ، وەك دوایش



**بۆکاشیۆ**

باسی‌ده‌که‌ین.نه‌یتوانی به‌قوولی له‌ دیارده‌ سیاسی‌یه‌کانی ژیان‌و هێزه‌ نه‌بینراوه‌ بزوێنه‌کانیان بکات .

بیروڕاکانی ئێرازمۆس ده‌رباره‌ی ژیانی سیاسی هه‌رچه‌نده‌ تاڕاده‌یه‌ك ساده‌و ساکارن ، به‌ڵام بۆ ئه‌وسای ئه‌ورووپا که‌م‌بایه‌خ نه‌بوون . ئه‌و بۆخۆی پیاوێکی هێدی‌و هێمن ، له‌سه‌رخۆو یه‌کجار نه‌رم‌و نیان بوو ، به‌ سروشت سه‌ر به‌ ئاشتی‌و دژ به‌ شه‌ڕ بوو . هه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ش له‌گه‌ڵ هیچ ئاڵوگۆڕێکدا نه‌بوو که‌ هێزی تێدا به‌کاربهێنرێ . پێی‌وابوو هۆشی وردو خوێنده‌واریی به‌رزو زانینی زۆر بۆیان هه‌یه‌ مرۆ له‌ کێشه‌و چه‌رمه‌سه‌ری‌و ، ده‌وڵه‌تان له‌ بێنه‌وبه‌ره‌ ڕزگار بکات .ده‌یگوت عه‌قڵی مرۆ که‌ لقه‌بۆپه‌ی به‌رزی‌یه‌ ده‌توانێ ببێته‌ بناغه‌ بۆ هه‌ر ڕژێمێکی سه‌رکه‌وتوو ، بۆیه‌کا سووربوو له‌سه‌رئه‌وه‌ که‌ ده‌بێ میر هه‌میشه‌ په‌نای بۆ به‌رێ تاوه‌کو له‌ڕێگه‌یه‌وه‌ بتوانێ تۆوی شه‌ڕو دووبه‌ره‌کی‌و ناحه‌زیی ناو کۆمه‌ڵ بنبڕبکات .

هه‌مان‌کات ئێرازمۆس فه‌رمانڕه‌وایانی ئه‌ورووپای هانده‌دا هه‌وڵ‌بده‌ن خۆیان لای گه‌ل خۆشه‌ویست بکه‌ن . لێره‌دا ئێرازمۆس به‌ته‌واوه‌تی له‌ ئه‌رکه‌کانی قۆناغ تێگه‌یشتبوو ، به‌تایبه‌تی ئه‌گه‌ر له‌یادمان بێ ئه‌وساکه‌ له‌ سه‌رانسه‌ری جیهاندا میرێك نه‌بوو ، وه‌ك ئه‌و ده‌یویست ، دڵ‌نه‌رم‌و له‌سه‌رخۆو گه‌ل‌په‌روه‌رو وه‌زیره‌کانیشی وه‌ك خۆی پیاوی دانسقه‌و لێهاتوو، هه‌موویان شاره‌زای کون‌و که‌له‌به‌ری نیشتمان بن(13).

هه‌ر له‌به‌رئه‌وه‌ش بوو ئێرازمۆسی ڕۆته‌ردامی بایه‌خی زۆری ده‌دا به‌ خوێندن‌و خوێنده‌واری . خوێنده‌واری به‌لایه‌وه‌ باشترین هۆی په‌روه‌رده‌کردنی دروستی بیرو هۆشی مرۆیه‌ ، بۆیه‌ به‌شێك له‌ نووسینه‌کانی بۆ باسی په‌روه‌رده‌ ته‌رخان کردووه‌و په‌رده‌ی له‌ ڕووی ناته‌واوی‌یه‌ زۆره‌کانی شێوازی خوێندنی قۆناغی ده‌ره‌به‌گی لاداوه‌و گه‌لێك هێرشی بردۆته‌ سه‌ر دارکاری‌کردنی قوتابی‌و جۆری ده‌رس‌وتنه‌وه‌ی مامۆستایان‌و داوای لێ کردوون هه‌وڵ‌بده‌ن مه‌به‌سته‌کانیان به‌جۆرێکی ڕوون‌و بێ‌پێچ‌و په‌نا بگه‌یێننه‌ قوولایی ده‌روونی شاگرده‌کانیانه‌وه‌ .

ئێرازمۆس به‌ ته‌وس‌و گاڵته‌پێ‌کردنه‌وه‌ باسی مامۆستایانی ڕۆژگاری خۆی کردووه‌ . له‌ یه‌کێك له‌ شاکاره‌کانیدا نووسیویه‌ ده‌ڵێ :

« هه‌موان ده‌زانن ... ئه‌و مامۆستایانه‌ هه‌ڵده‌گرن نه‌ك ڕۆژی پێنج وچانی وه‌ك ئه‌لیاده‌ی ( هۆمیرۆس ـ ك . م . ) ، به‌ڵکه‌ ڕۆژی پێنج‌سه‌د جار به‌ر له‌عنه‌ت خرێن له‌سه‌ر جۆری بیرو قوتابخانه‌ بۆگه‌نه‌کانیان . قوتابخانه‌ن یا به‌ندیخانه‌، یا کارگه‌و قه‌سابخانه‌ن‌و بۆ قوتابیان دانراون ؟. چه‌ند پیر بن ، بێ به‌ڵام کردن ، هێند که‌ر ده‌بن ، وادەزانن که‌س به‌ قوله‌پێ‌یاندا ناگات .. به‌ ناو پۆله‌کاندا وه‌ك که‌ڵه‌شێر دێن‌و ده‌چن ، کوێرانه‌ به‌و دوو سه‌ره‌ واوه‌ی ده‌یزانن ده‌که‌ونه‌ گیانی جۆراوجۆری باس‌و بابه‌ت. .بڕوا بفه‌رموون ئه‌وه‌ی ئه‌وان ده‌یزانن پوولێکی قه‌لب ناهێنێ ! »(14) .

واش‌بوو ، کڵێسه‌ کارێکی ئه‌وتۆی کردبوو مامۆستایانی قۆناغی ده‌ره‌به‌گی ته‌نها له‌ مه‌یدانی ئایین‌و فه‌لسه‌فه‌دا شتێکی که‌م بزانن ، هه‌رچی بۆنی زانستی نوێی لێ بهاتایه‌ نه‌ده‌بوو ئه‌وان توخنی بکه‌ون ، فێرگه‌کان نیمچه‌ به‌ندیخانه‌یه‌ك بوون بۆخۆیان‌و ئینجا له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ش ته‌نها منداڵانی چین‌و ده‌سته‌کانی سه‌ره‌وه‌ی کۆمه‌ڵ بۆیان هه‌بوو ڕوویان تێ‌بکه‌ن . که‌واته‌ ڕزگارکردنی خوێندن‌و خوێنده‌واری له‌ کۆت‌و زنجیره‌ قه‌به‌کانی سه‌ده‌ ناوه‌نجی‌یه‌کان یه‌کێك بوو له‌ ئه‌رکه‌ گرنگه‌کانی سه‌رشانی ڕووناکبیران . ئێرازمۆس ده‌یگوت ئه‌رکی نموونه‌یی سه‌رشانی ئه‌دیبی لێهاتوو کاری بێ‌وچانه‌ بۆ نه‌هێشتنی نه‌زانی که‌ به‌ ده‌ردی کوشنده‌ی کۆمه‌ڵ‌و هۆی ناته‌واوی‌یه‌کانی داده‌نا .

ئێرازمۆس بۆ خۆی وه‌ك پیاوێکی زیره‌ك‌و لێهاتوو مامۆستایه‌کی به‌رزو پشتی قوتابی‌و شاگردو هاوه‌ڵه‌کانی بوو ، به‌ پێشکه‌وتنیان گه‌شه‌ی‌ده‌کرد ، واته‌ نموونه‌ی زانای ڕه‌سه‌ن بوو نه‌ك ئه‌وانه‌ی پێشکه‌وتنی قوتابی‌و هاوڕێکانیان خورپه‌ی له‌ دڵیان هه‌ڵده‌ساندو ڕووی گرژ ده‌کردن ، ئه‌وانه‌ی ، ناشکوری‌ئه‌ بێ ، لای خۆشمان که‌م نین !. به‌دڵسۆزی ، نه‌ك له‌ پێناوی پاره‌و پوولدا یا بۆ مه‌به‌ستی‌تر ، « کتێبی جوانکاری »و چه‌ند به‌رهه‌مێکی‌تری بۆ فێرگه‌کان دانا . چاپی یه‌که‌می « کتێبی جوانکاری » ساڵی 1529 بڵاوکرایه‌وه‌و له‌ ماوه‌ی بیست ساڵدا چل جار چاپ‌کرایه‌وه‌ .

به‌ هه‌مان ده‌ستوور ئێرازمۆس بایه‌خی زۆری به‌ ڕابوردوو ده‌دا،ڕۆژگاری کۆنی ڕۆمان‌و گریکی به‌رز ده‌نرخاندو، وه‌ك گوتمان ، زمانی هه‌ردوو لایانی ده‌زانی . هه‌روه‌ها له‌ ڕێگه‌ی چه‌ند به‌رهه‌مێکی‌یه‌وه‌ زیاتر سه‌رنجی ڕووناکبیرانی

ئێرازمۆس

ڕۆژگاری ڕێنیسانس بۆ دەسکەوتە گەورەکانی ئەو قۆناغە گرنگەی ئەورووپا ڕاکێشا . بەهادارترینی بەرهەمەکانی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی لەو مەیدانەدا ئەو شاکارەیەتی کە سالی 1500 بە ناوی « کتێبی پەندی پێشنیان»موە بلاوی کردەوە(15). ـە چاپی یەکەمی ئەو کتێبەیدا 800 پەندی هەلبژاردەی گرێکی ـەگەڵ لێکدانەوەو لێدوانی قوولی خۆیدا بلاوکردەوە کە ڕووناکبیرانی ئەورووپا یەکسەر قۆستیانەوە ، ئەوەی وای لە ئێرازمۆس کرد چەند جارێك چاپی بکاتەوەو هەر جارەش کۆلێك پەندی دانسقەی نوێی بخاتە سەر تا بەر لە کۆچی دوایی کردنی ژمارەی ئەو پەندانەی کتێبەکەی خۆی دا لە چەند هەزارێك . ئەو بەرهەمەی ئێرازمۆس تەنها لە ژیانی خۆیدا 60 جار چاپ کرایەوەو کرایە ئینگلیزیو فەرەنسەییو ئیتالیاییو ئەلەمانیو هۆلەندەیی .

دلسۆزیی ئێرازمۆس بۆ ئایینی عیسایی خستیە سەر ڕێگەی لێکدانەوەی ئینجیلو وەرگێرانی بۆ سەر زمانی لاتینی. لەوکارەیدا ئێرازمۆس وەستاییەکی بێهاوتای نواند ، ئینجیلی وەها ڕەوان کردە لاتینی کە خوێندەواران بەئاسانی بتوانن لە ناوەرۆکی تێبگەن ، لەکاتێکدا هەموو وەرگێرانەکانی بەر لەو وشکو ڕەقو ناتەواو بوون . ئەم کارەو لێدوانەکانی تری ئێرازمۆس خۆی کارێکی ئەوتۆیان کرد ڕووناکبیرانی ئەوسای ئەورووپا باشتر لە ئایینی عیسایی بگەنو بزانن تا چ ڕادەیەك کڵێسە لە ڕێی ڕاست لایداوەو ئایینی کردۆتە داردەستی خزمەتی پاپاو قەشەو ڕەبەنەکانو هۆی کوێرکردنەوەی زەینی زۆربەی گەل .

لەوڕێگەیەوە ئێرازمۆس بێئەوەی بۆ خۆی بییەوێ بووە هۆی گەیینی مەرجە پێویستەکانی تەقینەوەی شۆڕشی گەورەی چاككردنی ئایین لە ئەورووپادا کە بەر دوا قۆناغی ژیانی کەوت. وەك گوتمان ئێرازمۆس لەلایەکەوە ئیمانداریکی دلسۆزو(16) لە لایەکی تریشەوە دژ بە شۆڕشو ئالوگۆڕی کتوپڕ بوو، بۆیەکا نەبووە لایەنگری بزووتنەوە گەورەکەی مارتن لۆتەری بەناوبانگ ، بەلکو بەپێچەوانەوە دژیشی وەستاو بە نووسین هێرشی بردەسەر ، هەرچەندە سەردارانی ئەو بزووتنەوەیە بە دل هەولیاندا ڕایبکێشنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە(17) کە بەڕاستی جێگەی شیاوی ئەو بوو . هەموان دەیانزانی ئێرازمۆس چۆن بە ئەوپەڕی دلسۆزییەوە هەولدەدات خۆیوتەنی «خانەی خودا لە نەزانیی بەربەری ڕزگار بکات»(18) .

لەهەمان کاتدا دوژمنانی» بزووتنەوەی چاككردنی ئایین»یش کە سەر بە کڵێسەی کاتۆلیکی بوونگەلێك هەولیاندا ئێرازمۆس ڕاکێشنە ناوڕیزەکانی خۆیانەوەو چەند پایەیەکی بەرزیان بۆ پێشنیار کرد ، بەلام ئەو هەموو جارێك یەك وەلامی دەدانەوە « دمەوێ شیرێکی بێقەلغانو ئازاد بم ! » . دەبێ سەرنجی ئەو وەلامە بەرزە لەو قوژبنەشەوە بدەین کە ئێرازمۆس بەشی زۆری ژیانی بە نەداریو دەستکورتی بردەسەر .

دیسان ئێرازمۆس بێئەوەی بۆ خۆی بییەوێ لە ڕێگەی ژمارەیەك بەرهەمی تریەوە گەورەترین خزمەتی پێشکەش بە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی چاككردنی ئایین کرد(19) . لەو بەرهەمانەیدا بە شێوازێکی ڕازاوەی پڕ لە تەوسو توانج گالتە بەو پیاوە ئایینییانە دەکات کە لە هەموو بازاڕێکدا زۆر هەرزان خۆیان دەفرۆشن ، ئەوانەی لە خۆیانو گیرفانیان بەولاوە بیر لە هیچیتر ناکەنەوەو داردەستی کاریشیان،بەداخەوە، ئایینە. کەم کەس وەك ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی توانیو بە وێنەی قەشە ورگنە گوپ هەلاوساوە سوور هەلگەڕاوەکانمان لەسەر تەختی برسێتی هەژاران بۆ بکێشێ ، ئەو قەشانەی خۆیوتەنی « زیانیان لە قازانجیان زیاترە » ، ئەوانەی « بە مەی تاوانی خەلکی لەناو ورگیاندا دەتوێننەوە »و بە « نوشتە تاوانڕەوێنە بێ نەڕەکانیان » گیرفانیان دەئاخنو ئینجا لەگەڵ ئەوەش هەریەکەیان وای نیازە بە خۆیو تەزبیحو ڕیشی درێژیەوە بێتە دەستەڕاستی عیسای پێغەمبەر!. « جا ئەگەر کەرێتیو سادەیی خەلکی نەبوایە کڵێسە چۆن خۆی پێ ڕادەگیرا ؟ » — بەوجۆرە پرسیارانە ئێرازمۆس ڕووناکبیرانی دەهەژاندو هۆشی دەهێنایەوە بەبەریانا .

ئەو جۆرە وێنانە زۆر جار لە «ستایشی کەران »دا بەرچاو دەکەون . « ستایشی کەران » بەرزترین شاکاری ئێرازمۆسی نەمرە (20) کە پاشبەندی ئەدەبیی ڕۆژنامەی « تایمس »ی بەناوبانگی لەندەنی پاش پتر چوار سەدە ناوی « نارنجۆکی ڕێنیسانس ئایینی »ی لێناوە .

کەم بەرهەمی نووسەرە کەلەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس بەڕادەی « ستایشی کەران » دەنگیداوەتەوە . ڕەنگبێ لێرەدا ئەوەند بەس بێ بلێین « ستایشی کەران » تەنها لە ژیانی

خاوەنیدا چل دانە جار لەسەر یەك چاپکرایەوەو بە دەیان هەزار دانەی بە هەر چوار قورنەی ئەورووپادا بلاوکرایەوەو بە دەستوبرد گۆردرایە سەر دوازدە زمانی زیندووی ئەو کیشوەرە. سەنگی ئەو ژمارانە لە تەرازووی ئەوسای جیهاندا یەکجار قورسە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەیش لەیادنەکەین کە چاپی نوێ هێشتا کورپەیەکی لە خەم نەڕەخسیو بوو، ڕووناکبیرو کۆلکە خوێندەوار لە شاراندا بە پەنجەی دەست دەژمێردران. وەك دەگێڕنەوە بەدەگمەن خوێندەوارێکی ئەورووپایی هەبوو بەپەرۆشەوە «ستایشی کەران»ی نەخوێندبێتەوە. تەنانەت پاپایان جۆلیۆسی دووەمو لیۆی دەیەمیش ئەو بەرهەمەی ئێرازمۆسیان لە بەرگەوە تا بەرگی خوێندۆتەوەو سەربەقوڕ لەگەل ناوەرۆکیدا پێکەنیون(21). بێگومان ئەگەر «ستایشی کەران» دلسۆزانە بیرازی دەردەکانی کۆمەلی نەکردبوایە هەلبەت ڕووناکبیران وا گەرم نەیاندەقۆستەوە.

ئێرازمۆس سالی 1509 «ستایشی کەران»ی داناوە، وەك خۆی دەلێ بە حەوت ڕۆژ تەواوی کردووە. هەرچەندە کەرێتی کەران وای لە ئێرازمۆس کرد ئەو شاکارەی بنووسێ کە بریتی‌یە لە سکالایەکی ڕەوا لە دەست نەفامان، بەلام لە هەمان کاتدا ناوەرۆکی ئەوەش دەگەیێنێ کە گۆڕینی دەوروبەری پڕ لە گێلو بەخیلو چاوبرسی‌و خۆپەرست کاری ڕۆژو دوو ڕۆژ نی‌یە. ڕاستە ڕەخنەکانی ئێرازمۆس ڕەق‌و جەرگبڕن، بەلام ئەو عەودالی ڕێگەی ڕاستو ڕەوان بوو کە پێی وابوو ڕەخنەی توندو تیژ مرۆڤیان دەگەیێنێ. پێویستە ئەوەیش بلێین کە لەگەل هەرەس‌هێنانی ڕژێمی دەرەبەگی‌و سەردەرهێنانی سەرمایەداریی کێشەکانی کۆمەل لە جاران زیاتر بوون. ڕەنگبێ ئەوەی کە ژمارەی پارێزەران لە ڕۆژئاوای ئەورووپای ئەوسادا بە جۆرێکی هەستپێکراو بەرەی سەند باشترین بەلگە بێ بۆ پێسەلماندنی ئەو ڕاستی‌یە. ئێرازمۆس دوای دانانی «ستایشی کەران» بە نزیکەی یازدە سال لە نامەیەکیدا کە بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی نووسیوە دەلێ:

> «هەرچەندو لە هەر شوێن تووشی گێژاوی بەرەللایی مرۆ دێم زیاتر باوەڕ دێنم کە لە هیچ چەرخێکدا بێئابڕوویی‌و کەرێتی‌و ستەم وەك ئێستە باو نەبووە».

ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی کە خۆی نەبوونیی‌چێشتبوو، دۆستی هەژاران‌و لایەنگری یەکسانیی چین‌و دەستەکانی کۆمەل بوو. هەرچەندە لەوەیشدا ئایینی عیسایی ڕابەری یەکەمی بوو، بەلام وردە نوێکاریی خۆی هەر کردووەو ڕەخنەی لە خودمالی گرتووە. هەروەها جاروبار پڕیشکی توانج‌و پلارەکانی بازرگانە نوێکانیشی گرتۆتەوە، ئەوانەی، وەك دەیگوت، بوونەتە هۆی گرانیی کەل‌وپەل‌و خراپبوونی بابەتیان. بەلام ئێرازمۆس، وەك گەلێك شتی گرنگی‌تر، دەیویست تەنها لە ڕێگەی میرو پاشایانەوە بەربەستی ئەو ناتەواوی‌یانەی کۆمەل بکات.

ئێرازمۆسیش وەك هاوەلەکانی هەموو نیشانەکانی دروست پێ نەپێکرا، لەوەدا ئەویش، وەك ئەوان، کوڕی ڕۆژگاری خۆی بوو. وەك گوتمان لە بڕوایدا بە میرو پاشایان زێدەڕۆیی دەکرد، دەیویست ئەوان هان بدات بۆئەوەی بە دەستی خۆیان ڕژێمەکانیان بگۆڕن، لەکاتێکدا بە چاوی خۆی دەیبینی چۆن بالی بالدارو نالی نالدار دەشکێنن‌و زمان لە بن دەردەهێنن‌و چاوان هەلدەکۆلن‌و سەران دەپەڕێنن بۆ پاراستنی ڕژێمەکانیان کە بەلای خۆیانەوە لە هیچیان کەم نەبوو. ئێرازمۆس لەوە دلنیا بوو بە بانگەوازێکی ئەو پاشای پورتوگال هۆشی دێتەوە بەبەراو بازاڕی ڕەشی بازرگانە نوێکان بنبڕ دەکات. لە هەلوەستیشیدا بەرامبەر «بزووتنەوەی چاککردنی ئایین» کەوتە هەلەیەکی گەورەوە. لەوەدا ئێرازمۆس هەر دوورەپەرێز لەئاستی ڕەوڕەوەی مێژوودا نەوەستا، بەلکو ویستیشی کۆسپی بنێتە بەر(22). پێی وابوو دەبێ گەلان لەئاستی زۆرداریدا دان بەخۆدابگرن نەبا بزووتنەوەیان ببێتە هۆی نانەوەی ئاژاوە.

بەلام ئەو ناتەواوی‌یانە بۆیان نی‌یە هیچلە پایەی بلندی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی کەمبکەنەوە. ئێرازمۆس زۆر کەم لە کتێبەکانی دوور دەکەوتەوە، نووستنی کەم‌و خوێندنەوەی زۆر بوو، بۆ خۆی دەیگوت «ئەو شوێنە خانەمە کە کتێبخانەکەمی لێ‌یە». هەروەها ئەوانەی تێکەلیان دەبوو دەستەیەکی تایبەتیی وەك خۆی بوون، بۆیەکا نەیدەتوانی تەواو هەموو لایەنەکانی دەردو ئازاری کۆمەل ببینێ‌و هێزە بزوێنە نهێنی‌یەکانی دەستنیشان بکات.

شایانی باسە ئێرازمۆس بۆ خۆی باش دەرکی کردبوو کە لەوانەیە بیروڕاکانی بێکەموکورتی نەبن. «تۆ بلێی ئێرازمۆس بەتەنها لەناو هەمواندا بێ‌هەلە بێ؟ . لەوانەیە ئۆگەستین‌و جیرۆمیش(23) کەوتبنە هەلەوە». ئەمە گوتەی ئێرازمۆس خۆیەتی کە پێی‌وابوو «ئەگۆڕیی هەلوەست تەنها لە دووپاتکردنەوەی یەك فەرمایشتدا نی‌یە، بەلکو لەوەشدایە هەمیشە هەولی پێکانی هەمان نیشان بدرێ».

وەك لە سەرەتاوە گوتمان لە سەرتاپای ئەورووپای ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا کەم زانا هەبوو بتوانێ شان لە شانی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی بدات. مێژوونووس هەن بە بالاترین ڕووناکبیری ئەو قۆناغەی دادەنێن(24)، هەشن نازناوی «میری

زانایان » یان بۆی هەڵبژاردووە(25) . هەموان بە چاوی ڕێزەوە تێیان دەڕوانی ، بۆ خۆیشی هاوڕێی دڵسۆزی هەموان بوو. تۆماس مۆری دانەری بناغەی بیروباوەڕی « سۆشیالزمی یۆتۆپی »ی کە بەشی داهاتووی باسەکەمانی بۆ تەرخان دەکەین، یەکێك بوو لە هاوڕێ گیانی بە گیانێکانی ، چەند ساڵێکیان لە ئینگیلتەرە پێکەوە بردەسەرو دوایش مەرگ لێکی بڕین . ئێرازمۆس « ستایشی کەران »ی بە تەوسێکی ناسکەوە پێشکەش بە مۆر کردو هەر لە ڕێگەی ئەویشەوە کاتی خۆی هێنری هەشتەمی پاشای ئینگیلتەرەی ناسی .

**- ماویەتی -**

---

## پەراوێزەکان :

1 - Erasmus Rotardamus.

لەم بەشەی وتارەکەمەوە ناچاربووم هەمووناوە بێگانەکان بهێنمە ناو پەراوێزەوە چونکە وادیارە چاپکردنیان لەگەڵ ناوەرۆکی باسەکەدا کارێکی ئاسان نییە بۆیەکا تیپکارانی چاپخانەکە شوێنی ئەو ناوانە بە سپێتی دەهێڵنەوە .

2 ـ ساڵی 1484 باوکی کۆچی دوایی کرد بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ بۆ خۆیو براکەی بەجێبهێڵێ .

3 ـ ئەگەر ڕەبەن (راهب)و (راهبە) بێ ئەوا دەتوانین ڕەبەنگە لەسەر کێشی پرسگەو پەناگە بۆ (دیر)و (أدیرة) بەکار بهێنین .

4 - (Theology)

واتە (لاهوت) یا زانستی ئایین .

5 ـ (بال)یش دەگوترێ .

6 - Desiderius .

7 - Gerhard Gerhards.

8 ـ وەك زانای سویسرایی فرنەری کایجیو زانای هۆڵەندەیی یۆهان هۆیزنجا ( بڕوانە : « اعلام وافکار . نظرات فی التأریخ الثقافي » ، تالیف المؤرخ الهولندی الکبیر یوهان هویزنجا ، ترجمة عبدالعزیز توفیق جاوید ، مراجعة الدکتور زکي نجیب محمود ، القاهرة ، 1972 ، ص366 ، 383 ـ 384 .

9 - Humanism.

10- (Enchiridion Militis Christiani).

11- (Antibarbarorum Liber)

12- (Institutio Principis Christiani).

13- "Action and Conviction in Early Modern Europe", Editors J.K. Rabb and J.E. Seigel, Princeton, 1969 pp. 20 - 21.

14ـ ئەم قسانەی لە « ستایشی کەران »دا کردووە کە دوایی بەدرێژی باسی دەکەین .

15- (Adagia).

16ـ تا دوا هەناسەی ژیانی ئێرازمۆسی ڕۆتەردامی بە دڵسۆزی بۆ ئایینی عیسایی مایەوەو خۆی بە سەربازی عیسا دادەناو 1504 کتێبێکی بە ناوی « پەیامی سەربازی عیسایی »یەوە دانا .

17- H.G. Koenigsberger and G. L. Mosse, Europe in the Sixteenth Century, London, 1968, p. 103.

18ـ ئەو ڕستەیەی لە کتێبی « میری عیسایی »دا گوتووە .

19ـ گەلێك زاناو مێژوونووس بزووتنەوەی چاككردنی ئایین ( حرکة الاصلاح الدینی ) کە سەرەتای سەدەی شازدەمین لە ئەورووپادا تەقییەوە بە شۆڕش دادەنێن .

20- (The Praise of Folly).

دەقی وەرگێرانی ئەو ناوە « ستایشی کەرێتی »یە ، بەڵام پێموایە بەکوردی ئاوازی « ستایشی کەران » خۆشتر دێتە گوێ بۆیەکا ئەو وردە دەستکارییەم لە ناوەکەیدا کرد . نووسەرانی عەرەب ناوی ئەو کتێبەیان کردۆتە « تمجید السفاهة » یا « مدح الحماقة » یا « الثناء علی الطیش ». شایانی باسە مامۆستای بەڕێزو هاوڕێو برای خۆشەویستم دوکتۆر عبدالقادر احمد الیوسف ئەو شاکارەی ئێرازمۆسی کردۆتە عەرەبیو هێشتا بڵاوی نەکردۆتەوە . بۆ باسی ئەو بەرهەمەی ئێرازمۆس کەڵکم لە دەستنووسەکەی ئەویش وەرگرتووە .

21- E. S. Crosby, Reformation and the Reformers, Amesterdam, 1963, p. 82.

22ـ بە ناوی « سەربەستیی ڕا »وە ئێرازمۆس کتێبێکی دژی مارتن لۆتەری ڕەهبەری پرۆتستانتەکان بڵاوکردەوە .

23ـ دوو ڕابەری گەورەی ئایینی عیسایی بوون .

24- "Renaissance and Reformation, 1300 - 1648", ed. by G. R. Elton, Second edition, New York - London, 1968, p. 59.

25- R. Palmer and J. Colton, A history of the Modern World, third edition, New York, 1965,p.51.

«عوسمان هەورامی»

## نوێشکێ دەربارەی

# «بێسارانی»ی بلیمەت

### ١ - کۆکردنەوەو ئامەدەکردنی هۆنراوەکانی :

پاش کۆشش و تەقەلایەکی زۆری بێوچان و بە دەستهێنانی چەندان دەستنووسی کۆن[1] تا ئێستا توانیومە زۆربەی هۆنراوەکانی هۆنەری بلیمەت و هەڵکەوتووی کورد مامۆستا بێسارانی کۆبکەمەوە .

شایانی باسە کە لە هاوینی [١٩٧٥] موە لە گەڵ مامۆستایانی بەڕێز مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس و کاک محمدی کوڕیدا ، دیوانی بێسارانیمان ئامادە کردووە بۆ چاپ .... بەم چەشنە بە هیوایین گیانی بێسارانی شادبێ و جەستەی گڵکۆی لە ئارامی هەمیشەییدا بحەوێتەوە و سەر لەنوێ لە دایك بێتەوە ، ... چونکە بەڕاستی - دوای خۆیشی - شیعرەکانی وەك سەردەمی ژیانی خۆی وێڵ و سەرگەردان و ناشادو لانەواز بوون .

### ٢ - نەژادی :

ئەم هۆنەرە مەزنەمان ناوی [موستەفا] یەو کوڕی [مەلا ئەحمەد]ە .... مامۆستای پایە بەرز [سەید طاهری هاشمی] ئەڵێ : مەلا عەلی بێسارانی کە ناز ناوی صەبیارە ، تەمەنی حەفتا ساڵ ئەبێ و خەڵکی سنەیە ، ئەڵێ : وەك لە شارەزایان و زانایان بیستوومە و ئەوانیش لە باوو باپیرانیانەوە بیستوویانە مەلا موستەفای بێساران خەڵکی گوندی شمشێری لای خانەگاو پاوەیە ، پاش تەواوکردنی خوێندن لە شارو گوندەکانی ئەو سەردەمەی کوردستاندا ، هاتووەتە بێساران و بووە بە مەلای ئەوێ و لەوێ ماوەتەوەو بە مەلا موستەفای بێساران ناوی دەرکردووە ...

شایانی باسیشە کە خانەگاو شمشێرو پاوە مەڵبەندو کۆڕی زانیاری بوون و ، بە دەیان زانای گەورەو ناوبانگیان تیا هەڵکەوتوون ...

هەروەها مامۆستا هاشمی ئەڵێ : مەلا محمدی جوانڕۆش کەنەوەی برای بێسارانییە و لە دەوروبەری [١٨٦٠] دا کۆچی کردووە ، پێ هاتووە کە بێسارانی خەڵکی گوندی شمشێرەو بەر لە ساڵی هەزاری کۆچ ، کۆچی دوایی کردووە .... دەستنووسی ئەم مەلا محمدە لای سەید طاهری هاشمییە ... مامۆستای پایە بەرزیش علاءالدین سجادی ئەڵێ : بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆمان دەرکەوتووە ، بێسارانی لە - ١٠٥٢ - ی کۆچیدا ، بەرانبەر - ١٦٤١ - ی زایین ، لە دێی بێساران هاتووەتە دنیاوە ، لە - ١١١٣ - ی کۆچیدا ، بەرانبەر - ١٧٠٢ - ی زایین لە تەمەنی - ٦١ - ساڵیدا کۆچی دوایی‌کردووە ... هەروەها مامۆستای ناوبراو ئەنووسێ : بێساران گوندێکە لە ژاوەڕۆ ، بە ماوەی - ٣٠ - میلێك کەوتۆتە خوارووی ڕۆژئاوای شاری سنەوە[2] ...

### ٣ - سەرچاوەی هۆنراوەو ئەوینی :

لە سەرنجی سەراپای هۆنراوە کانیا تێکرا بۆمان دەرئەکەوێ و دیارە کە بێسارانی بە سروشت هۆنەرو شاعیرەو ، بە چەشنی سەرچاوەی تەقیوی سەردەمی بەهارو ، لەکاتی ئاسایی خۆیا جۆشی گیان و دەروونی هەستا وەو سەری کردووە ....

لەسەراپای هۆنراوەکانیا دەرئەکەوێ کە - سێ - سەرچاوەی ئەوین و هۆنراوە لە دڵی بێسارانیدا کاریگەر بوون و شوێنەواری قووڵیان ڕوون و ئاشکرایە ....

یەکەم ، نازداری گیانی ... کە بەدڵ و دەروونێکی خاوێنەوە هەموو هەست و بیرو هۆشی بە دەوریا گەڕاوە ، ... بە ڕادەیەکی وا خولیای هەمیشەیی بووە ، بتەرست ئاسا ڕووی کڕنووشی هەمیشەیی لێ بووەو هەموو بوون و نەبوونی هەر نازداری گیانیی بووە ... لە گەڵ ئەم هەموو ئەشق و ئەوینە خاوێن و پیرۆزە ، بەداخی زۆر گرانەوە ، بەناشادی سەری ناوەتەوەو بەکامی گیان و دەروونی بێ گەردی نەگەیشتووە ...



لێرەشا یادی دیوانەکەی شەم دێتە پێشەوە ، کە دوای بێسارانی سەری هەڵداو ، پتر درێژەی بە ئەوینی سووتێنەرداو ، هەمان خولی بێسارانی دووبارە کردەوە ، ... دوای هەزاران ئەشکەنجەو ناسۆرو تالاوی مەرگ ، کپو بێدەنگ ، پەروانە ئاسا ، بە دەوری ئەوینی گرداری شەمیا ، هێدی هێدی جەستەی توایەوەو یادی پڕ لە کڵپەی ئەمری مایەوە ، ... هەڵبەتە بەم چەشنەش ئەبوایە ئەم بەرهەمە بەرزانەشیان نەئەهاتنە کایەوە ... !!

بۆ ئەم مەبەست و بوارەش ، بە سەدان هۆنراوەو غەزەلی بەرزی وتوون ، یەك لەیەك كاریگەرترو بەچێژترو بەسۆزترن !.... لەم دەرفەتەشا هۆنراوەی ـ نالەی دەردەدار ـ ئەخەمە بەرچاو ... لەگەڵ سەرەتاو سەرەنجامی پڕ لە ناهەمواریدا ، بێسارانی هەر لە یەکەم چرکەوە زانیویەتی ڕێگەی ئەوینی ڕاست و بێگەرد ، بێ ئاخ و ناڵەو هاوار نابێ و ، ئەبێ دڵ و دەروونی شەیدا کانگای داخی پڕ لە ناسۆری بێ .... تاشەیداش دژواریی ڕۆژگار نەچێژێ ، بە کام ناگات ؛ هەر بەم پێیەش هەرچەندە گوڵ بێ درك نییە ، کەچی لە پێناوی ئەوینیا بولبول خۆشییەکی بێ هەمتا ئەچێژێو ، بە پەلەپرووزێ تەکان ئەدا بۆلای .... هەر کەسێکیش لە ئەشق و ئەوینەوە بە دووربێ ، هەرگیز ناگاتە مەبەستی ڕاست و دروست ؛ تا ئەشقی مەجازیش نەبێ ئەوینی ڕاست سەر هەڵنادات و نابێ ، لە ئەنجامیشا هەر کەس بە ئەشقی خۆی شاد نەبێ ، سەری هەموو دنیای لێ ڕێتەوە یەك و ، دەری ڕووناکی لێ ناکرێتەوەو بە نائومێدی سەر ئەنێتەوە ...

نالەی دەردەدار بێ ئاخ نەمەبو
دەروونی عاشق بێ داخ نەمەبو[٣]
عاشق تا دەمێ جەفاش نەمەبو
بێ جەفا هەرگیز سەفاش نەمەبو
گوڵ جە گولستان بێ خار نەمەبو
بلبل جە ئەشقش بێزار نەمەبو[٤]
هەرکەسێ ئەشقش ڕەفیق نەمەبو
واسڵ بە طەریق حەقیق نەمەبو .
مەحزوونیی عاشق بێ یار نەمەبو
عاشقان بێ یار مەدار نەمەبو[٥]

تا مەجاز نەبو حەقیق نەمەبو
حەقیق بێ مەجاز تەحقیق نەمەبو
شێوەی مەجنوونی بێ لەیل نەمەبو
کۆ کەنیی فەرهاد بێ مەیل نەمەبو
هەرکەس جە ئەشقش دلشاد نەمەبو
دەری خێر پەرێش گوشاد نەمەبو[٦]

## دووەم سەرچاوەی هۆنراوەی :

بریتی‌یە لە سروشتی ڕەنگین و بێ‌هاوتای ئەو ناوچانەی تیایانا ژیاوە ... بەهەر لایەکا ڕۆیشتووەو بۆ هەرلایەکی ڕوانیوە ، هەر چوار وەرز دیمەنی دڵکێش ڕاکێشاوەو بەبێ ئاگا دڵبەندی بووە ! .... خۆ ناوچەی هەورامانیش بۆ خۆی بە پەلی تایبەتی کردگار کێشراوەو ، ـ بێسارانی ـ ش وەکو مەلی بەهرەمەند ، بە ئارەزووی خۆی پیایا گەڕاوەو ، بەسەر خاك و دارو بەردیا چریکەی گیانیی بەرزکردۆتەوە شاخێ ، باخێ ، گوڵێ ، چلێ ، خەزان ، سیوەیل ، چەم و دوڵ و کۆم و کۆلاوێ ، ئەمامێ ، هەر چوار وەرز ، ... دەرناکات و تیشکی دڵی بە بالای هەموویانا پەخشان ئەکات و ، ئەوەندەی تر کاریگەرئەبن .... وەك شەیدایەکی ڕاستەقینەو بێ گەردیش لە هەموو دیمەنێکی جوان و شێوەیەکی قەشەنگا ، تەنیا هەر دڵدارە ئازیزەکەی لە بەرچاویەتی و ، وا دێتە پێش چاوی کە هەموو سروشتی ڕەنگین

ئاوێزانی جوانیی نازداری جوانیەتی :.... بەم چەشنە کە گیانی خۆی لە ناو ئەم جوانی‌یەی سروشتا ئەبینێ ، شێوەیەکی زۆر بلیمەت و هونەرمەندانە ، کە هەر لە خۆی بێت ، سەراپای بووکی سروشت پێوەن ئەکا بە بووکی کۆرپەی دەروونی‌یەوە .....

لە بواری ئەم مەبەستەشیا ، لە دیوانەکەیا ، بە دەیان هۆنراوە بەرچاو ئەکەون ؛ لێرەداو بۆ نموونە ، هۆنراوەی ـ سای سەهەندی سەنگ ـ پێشکەش ئەکەم .... بێسارانی ـی شەیداو دەروون پڕ لە کڵپەو بڵێسە هەمیشەو هەردەم هەموو یادی بریتی‌یە لە ئاواتی دەروونیی ؛ ئەوەتا ئاواتەخوازە هەموو بوونی لە هەناسەی پێک گەیشتنا لە گەڵ سەرچاوەی خۆشەویستیدا بتوێتەوە ؛ کەچی هەمیشەو لە هەموو شوێن و کاتێکا بەدکاری بەدخوو ، هەنگاو بە هەنگاو شوێن پێی هەڵئەگرێ‌و ، ناهێڵێ بچووکترین ئاواتیشی بێتە دی ؛ بۆیە ناچارە پەنا بەرێتە بەر دیمەنێکی بەجێ‌و دڵگیری سروشتی قەشەنگ‌و ڕازاوە ، کە پەنای زۆربەی سەردەمی گەڕیدەیی دوورو درێژیەتی ... بەم چەشنە لە بەرەیانێکا ، لەسەر لوتکەیەکی بڵندو لەسای تاوێرە بەردێکی گەورەدا ، بەهەناسەی ساردەوە سەرنجی دەورو بەری دوورو نزیک و هەموو لایەك ئەدا ؛ کێوو دەنگی‌و ئاسایش باڵیان کێشاوە بەسەر هەموو لایەکا ؛ شنەو سروەی سازگاری سپێدە ، قاسپەی کەوی نەخشین ، چریکەی مەلی ڕەنگاوڕەنگ ، جریوەی پۆلە چۆلەکە کێوی‌و ژیکەلەی کوێستانی هەست فڕێن ؛ .... نەك دڵێ ، هەزار دڵی بێ دەردیش شەیداو سەودا ئەبن‌و هەزاران ئاواتی شیرین سەر هەڵئەدەن .... بەڵێ بێسارانی ئاواتە خوازە لەگەڵ نازدارو هەڵبژاردەی دانسقەیا ، هەر لە بەیانەوە تا دوا هەناسەی ژین لەسایەی تاوێرە بەردێکی سەرکەشا تەمەن بەسەر بەرێ ؛ بەلام بەو مەرجەی نەیاری ڕەزاگران‌و نێسك قورس فرسەنگ بەفرسەنگ‌و قۆناخ بە قۆناخ دوایان نەکەوێ ؛ .... دوو بە دوو ، هەردوو بە خۆشی‌و شادی دانیشن‌و یادی تاڵی‌و شیرینیی ساڵانی ڕابوردووی دوورو درێژ بکەنەوە ؛ جار جارێکیش لە شەیدای هەڵپڕووزاوەوە نیازو ، لە نازداری هاوهەستیشەوە تاز ؛ ... بەم چەشنەو تا دوا هەناسەی تەمەن لەسایەی ئەم تاوێرەدا ژینی پڕ لەکام‌و ئاوات بەسەربەرێ ؛ چونکە بەڕاستی ، وەك بێسارانی ئەڵێ ، لەم دنیا هیچ‌و پووچەڵەدا ، هەر ئەمە سەرمایەیەو ، هەموو شتێکی تر پووچ‌و بۆشە ...

سای سەهەندی سەنگ ، سای سەهەندی سەنگ
سوبحدەم وەشەن سای سەهەندی سەنگ[7]
بەلام بە شەرتێ ڕەقیبی بەد ڕەنگ
نەکنونە وەنەت فرسەنگ بە فرسەنگ[8]
چەنی دۆسی وێت بنیشی بەشاد
ویەردەی ساڵان بلوەری وەیاد[9]
کلنیاز جە تۆ ، کا ناز جە دلبەر
ئەو پەی تۆ سۆزان تۆ جە ئەو بەتەر[10]
هەر تا کە عەمرت یاوۆ بە ئەنجام
نە سای ئەو سەنگدا بویاری بە کام[11]
ئێدەن سەرمایەی ئەی دنیای فانی
ما باقی پووچەن هەرچی مزانی[12]

سێیەم سەرچاوەی هۆنراوەی بێسارانی :

بریتی‌یە لە خۆشەویستیی یەك لایی‌و بێ‌گومانی پڕ لەباوەڕی بێ‌گەردی یەزدانی گەورە ؛ ... لەمەشا گەیشتۆتە پایەیەکی زۆر بەرزی ڕەوان‌و ، لە ئاسمانی فەلسەفەی سۆفیگەریی پوختا ، ڕەوان شادو هیوا بەهێزو بەرچاو بەرچاو ڕۆشنە ... بۆ نموونەی ئەم ڕێبازەش هۆنراوەی [ڕوێ کلێ دیم ئیمان مەپۆشا] پێشکەش ئەکەم ، کە یەکێکە لە دەیان هۆنراوەی بۆ ئەم مەبەستە لە کانگای دڵی بەتینەوە هەڵقوڵاون ...

والەدنیایەکی ، وەك دنیاکەی شێخ‌ بسەنعاناو ، بێ ئاگا لەخۆ ، بێساراتی وەکو پەلی بەربا ، بێ ئەوەی بزانێ سەرنجامی بەکوێ ئەکات‌و شەپۆلی دەریای هەڵچووی ئەوین بەرەو کوێی ڕائەپێچێ ، بوونی خۆی ئەهاوێتە ئامێزی ئەشقی ڕاستی‌یەوەو دڵی پابەندی ئەو زوڵفە زونتار ئاسایی‌یە ئەبێ ، وەك شەوە زەنگ ئەنوێنێ‌و بەری ڕوخساری پڕ لە گزنگی گرتووە ... دیمەنیش هەزاران ئەوەندەی تر دڵگیرترەو شاعیریش بەجارێ بڵێسەی بەرز بووەتەوە ..

بەم چەشنە سەرزەنشتی دڵ ئەکات ، کە بۆچی ڕووی لە

بووناکی وەرچەرخاندووەو پشتوێنی ئاگرپەرستیی لە کەمەرایەو ، وەك شێخی سەنعان ئیمان ئەگۆڕێتەوە بە زوننار !! ... لە ئەنجاما بە گوێچکەی دڵ وەلام وەرئەگرێ ، ڕێڕەوی ئەشقی ڕاستو بێ گەردی ناگۆڕێتەوە بە هەموو ئایینو دینی ناتەواوی پڕ لە ڕواڵەتو ڕیایی ؛ بە کڕنووشی ڕووکەشی شەوانو بەیانیانی بەناو خاوەن باوەڕەکانو ، ئەوانەی بەئەنقەست لە ڕێی ڕاست لایان داوە ....

ڕوێ کلوێ دیم ئیمان مەپوٚشا
دل ئیمان بە دەست کوففار فروٚشا[13]
دینی تەرسا گرت ، هور کێلا جەگشت
پەست بەست بە زوننار کلێسلو کەنشت[14]
واتم ئەی دڵە فامت شوٚ نەسەر
کێ بەستەن بەدین کوففاران کەمەر !![15]
دل وات بە خودای کارسازو کەریم
من جە دینی توٚ بێزارم ، بەریم ،
جەلقیوە جە زولف زوننارى دلبەر
نمەدمو بە مولك داراو ئەسکەندەر[16]
سوب سەدای ناقووس ، سەیری بتخانە
دینی تەرسایان ، کلێسا یانە
خاستەرمن جە دین ناتەمامی توٚ
جە سوجدەی ڕیای سوبحو شامی توٚ[17]

× × × × ×

**پەراوێزەکان :**

١ ـ هوٚنراوەکانی بێسارانیم لەم دەستنووسانەی خوارەوە وەرگرتوون :

(١) دەستنووسی بە نرخی ماموٚستای گەورە ـ سەید طاهری هاشمی ـ کە بەشی هەرە زوٚری هوٚنراوەکانی بێسارانی تیایەو ڕادەیان ئەگاتە [٩٠٪] .

(٢) دەستنووسی خوا لێخوٚشبوو ماموٚستا نەجمەدین مەلا .

(٣) دەستنووسی خوا لێخوٚشبوو عەلی کەمال باپیر .

(٤) دەستنووسی ماموٚستای پایە بەرز شێخ محمدی خاڵ ، کە لە سلێمانی لەکاتی هەڵوەشاندنی خانوویەکی کوٚنا ، لەناو پایەیەکا دوٚزراوەتەوە، لە پەراوێزی لاپەڕە ـ ٥٢ ـ دا ، ئەم ڕستەیە نووسراوە : [تاریخ عبدالقادر پسر خضر چاوش سنه ١٢٤٥] بوٚیشم ساخ نەبووەوە چەند ساڵ لەوەوپێش نووسراوەتەوە ؛ ئەم دەستنووسەش لە هەموویان دێرینترە .

(٥) دەستنووسی دوٚستی بەڕێزم ماموٚستا محمد علی قەرەداغی .

٢ ـ علاألدین سجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپی دووەم ، ١٩٧١ ، لاپەڕە ـ ٢٠٦ .

٣ ـ نمەبو : نابێ .

٤ ـ خار : دڕك ، چقڵ .

٥ ـ مەدار نمەبو : هەڵناکەن ، ئارامیان نی یە .

٦ ـ پەرێش : بوٚی .

٧ ـ سای سەهەندی سەنگ : سێبەری تاوێرە بەرد .

٨ ـ نەگنونە وەنەت : دوات نەکەوێ .

٩ ـ چەنی دوٚسی وێت : لەگەڵ دوٚستی خوٚتا ـ بنیشی : دانیشی ـ و یەردە : ڕابوردوو .... واتە : لەگەڵ دوٚستی خوٚتا بەشادی دانیشیو یادی ساڵانی ڕابوردوو بکەیتەوە .

١٠ ـ گا : جار ... واتە : جار جار لە توٚوە نیازو لە دڵبەزیشەوە ناز ، توٚ بوٚ ئەو سووتاو بیو ئەویش لەتوٚ بەتەر .

١١ ـ یاوێ : بگات ـ بویاری : ڕابوێری .

١٢ ـ ئێدەن : ئەمەیە .

١٣ ـ ڕوێ : ڕوٚژێ ـ مەپوٚشا : ئەپوٚشی ـ فروٚشا : فروٚشتی .

١٤ ـ هور کێلا : هەڵگەڕایەوە .

١٥ ـ فامت شوٚ نەسەر : هوٚشت کوا ؛ هوٚش لە سەرتا نەمێنێ .

١٦ ـ نمەدمو : نادەم .

١٧ ـ شام : ئێوارە .

## بارێزە

● سامان دزەیی

سالّەهایە دەمدەبینە دەست
شەپۆلی عیشقی سەرشێت
سالّەهایە ..
وەکو ڕێبوارێکی غەریب
ئەم دنیایەم پێ تەی دەکەیت
دەڵێی دەتەوێ نهێنی ..
ئەم گەردوونەم پێ دەربخەیت
دەریاکانم پێ پڕ بکەیت
لە بارانی فرمێسک‌و خوێن
چیاکانم لێ بار بکەیت
سالّەهایە ...
وەکو دار کاژێکی تەنیا
لەبەر بارێزەی ئەو عیشقەت ...

سەما دەکەم
ئەتێم دەگەی ئەتێت دەگەم
هەر ئەو ڕێبوارە غەریبەم
کە لەبەردەم چەقی ڕێتا
چەترێك بووم بەسەر سەرتەوە
لەبەردەمی باران‌و خۆر
سالّەهایە .. چۆلەکەیەکی خەمبارم
لەبەردەمی پەنجەرەکەت دەجریوێنم
نە پەنجەرەم لێ دادەخەیت
نە ڕۆژێکیش دەرم دەکەیت
دەتەوێ کام دڵ تاقی کەی
دڵی من یاخود دڵی خۆت
ئەی ئەو کچەی سالّەهایە ..
دەسووتێم بۆت

---

(١) بارێزە : باران بای لەگەڵدا بێت .

## تابلۆی

بە هەورازی زۆر سەختا هەڵ گەڕاوم
بەڕێ‌و بانی زۆر ئازاردا گەڕاوم

لەسەر تاقی زۆر کانی‌و ئاو دانیشتووم
زۆر مەترسی خەوی چاوی لێ کوشتووم

دۆڵی قوڵو لا پاڵی سەختم دیون
مەزرای زمنوێرو خۆش‌و تەختم دیون

دەستم خستۆتە ئاوی ڕنوە بەفران
شکاندوومە کۆزەی قۆتانە کفران ...

## عەشق

چاوەکانم بەدوای چاوتا ئاوارەن‌و ڕێگە ئەگرن
لەناو دەریایە فرمێسکا ، تاڵە تاڵە ، برژانگ ئەڕنن
خەمەکانم هەموو شەوێ کۆشی گەرمم ئەتاسنن
تاسەی دووریت لە دەروونما خەوی خۆشم ئەتاسێنن
دەردەکانم ، یەکە یەکە ، لافاوی ژان ئەبارێنن
ڕۆحی دەریای خۆشەویستی چاروسەد جار ئەشلەقێنن
پەنجەکانم لەناو ئازار ؛ پێنوس بەجۆش ئەگرێنن
ئەو فرمێسکەی ئەو ئەپرژێ کانیاوەکەی لەچاومایە

● ● ●

خەوەکانم هەموو شەوێ لەشکری خۆی ئەجوڵێنێ
شادەماری خوێن بەری دڵ ، ووردە ووردە ، ئەتەزێنێ

# بیرەوەرییەکان

غریب پشدەری ـ قەڵادزێ

چاوم لە چاوی چاو جوانان داگرتوون
لە داوەتێم دەستی نازداران گرتوون

لە نێرگزجاڕی ئەو بەهارانم چنیوە
پرچی بیزاو هەڵزو کەملم ڕنیوە

تەریان کردووم ڕێژنەی کەواڵە هەوران
لامداوەتە ڕەشماڵی ماڵە کەوران

درکەو داڵی ڕێم لەپێ هەڵ چەقیوە
کانی‌ی خوێنم لەژێر پێدا تەقیوە

وورەی گەرمای هاوینان سووتاندوومی
خانە خوێ‌ی ڕوو گرژو مۆن تۆراندوومی

ئەوانەو زۆر شتی تریش کەماون
لە بیابانی چۆڵی بیرما جێ ماون

خەونی تاوێك خۆشی نیێو ڕاببرن
دەگەڵ بەهارێکی تەمەنی کورتا بمرن

تابلۆیەکە ، بەهرەی ڕاستی‌و دڵسۆزی
تویشووی ڕێگای دوا ڕۆژێکی پیرۆزی .

# دڵێکی ئاوارە

حەمەی حاجی عەبدوڵلا

وەکو «یوسف» بۆ «زولێخا» لە زیندانا ئەمخزێنێ
گڕی عەشقی پڕ ئازارت ، لە دەماخا کڵپە دێنێ
ئەو کڵپەیەی[1] «بێ‌کەس» ئەڵێ تا وون‌بوونی ڕۆژ ئەمێنێ
دەستی خۆزگە ناگاتە تۆ ، خوزگەم ژانە ئەم‌هەژێنێ
وەکو منداڵ گرینۆکم ، ووکو مەتیو چاوچنۆکم : گڕی عەشق ئەمسوتێنێ
ئەو گڕەی وا بڵێسەی‌وێ‌گورەی گەشی لە دڵمایە

* * *

«حەسیب»[2] ئەڵێ وەکو «حەللاج» لەناو کڵپەی «انا الحق»دا خۆم ئەکوژم
منیش ئەڵێم لە ئەوینی عەشقی تۆدا بۆنی گوڵی دڵ ئەمژم

لە باوەشی تۆی نازدارا تاسەی دووری دڵ ئەشکێنم .
هەموو جیهان ، هەموو کەون ، لەبەر پێتا ، لەبەر پێما ، ئەلەرزێنم
دەستی ناحەز لەهەر کوێ‌بێ لەبن باڵا ئەیپەڕێنم
بەخوێنی خوم ئەتپارێزم ، وەکو چاوم ، وەکو دڵم ئەتلاوێنم
ئەبمە درك بۆ چاوی پیس ، بیلبیلەی چاو ئەتەقێنم
خۆشم ئەوێ‌ی وەکو شیعر ، وەکو ئاسمان ، وەکو ڕۆژی ئەوخودایە

(۱) بێ‌کەسی شاعیر
(۲) حسیب قرەداغی شاعیر

سلێمانی
ـ پایزی ـ ۱۹۸۲

# دیاری

جمال محمد اسماعیل

که منداڵ بووم
لەناو گەڵێك مێرگی شیندا
تلم ئەدا ......
تاوێ گوڵێ زەردم ئەچنی
دەمێك چەپكێ نێرگزم بۆت گرێ ئەدا .... !
تاوێ گوڵاڵەی خوێناویم بۆ ئەبردی
تلو نا تاوێ ......
چڵێ بیزای مهابادیو
هەڵاڵەی لای هەورامانم بۆ ئەکردی .

* * *

ئێستا گەورەبووی دەزانم
ئەو دیاریانەت لەمن ناوێ
ئێستا گەورەبووی پرپاسکەی
خەمت بۆ پێچاومە کەزی
خۆرەتاوێ ......
یا پرچی ئەو خۆرەت دەوێ
یا من دەبێ ئەیەمەوە
یا هەرچی ڕۆژ ژمێر هەیە
بۆ هەزار ساڵی تێپەڕبووی
بگێڕمەوە ......

* * *

بەڵام ئەفسوس ئەمن کەشتیم
تا بارگەی خەوی ژیانت بۆ بهێنم ...
نە ئەو شەپۆلە ئەستەمەم
هەرچی ملی بەوری هۆردووی ڕەشەبایە
بیبەزێنم ......
ئەوەی هەمە دڵێکی فێربووی شکاری جیاکانە
من جیاییم ......
تینوایەتیم بەکەوە بەفری قەدپاڵێ
بە چۆغەی ئانیشك دڕاوو
بە گەوەڕو بە هەرزاڵێ .

تینوایەتیم ......
بە بێری شان بە دەسماڵێ
دەبڕێتەوە ......
ئەوەی هەمە
خەرمانی خەم و ئازارو کۆڵنەدانە
سەرمی بۆ دەکەم بە لانە
دلی بۆ دەکەم بە پێخەف
بە جۆلانە ......
ئەوەی هەمە دایدە بەشم
وەك بیرەوەری ڕۆژگار
بۆ ناوچەوانی زەمانە ......
ڕوی ڕۆژنامەی ڕەنگاوڕەنگی
ئەم دنیایەی پێ دەشکێنم
کە بوون بە بڵند گۆی ئاڵی
ناو مەیخانە ......

* * *

هەرچەند ئەکەم بۆ متوربەی چارەنووس
سەرکەلێ ئەگرم ......
هەرچەند ئەکەم بۆ باوەشی ڕوناکی
ڕێگەیەك ئەبڕم ......
تا چی تۆفانی دەریایە
بۆتۆی دەکەم بەکاروانێ
ئەی هەناسەی بیرەوەری خۆزگەکانم .
تا چی ماچی تامەزرۆیە
لەسەر زانە ......
تا چی وڕێنەی سەنگەری
ڕێی ژیانە ......
خۆی گرمۆڵە دەکاتەوە
وەك بەفرەشینەی سەر دڵێ
بێ تاوانێ ......
ئەیکەم بە تێشووی ژیانێ
وەکو خەڵات ئەیدەم لە سینگو بەرۆکی
پەری خانێ ......

# ئێوارەیەك

دوكتۆر كاوس قەفتان

- ١ -

عیادە بچوكەكە هۆڵێكی تەنگو دوو ژووری لەو بچووك تر بوو ، لەسەر یەكێكیان نووسرابوو (پزیشك) ، لەو لاشی یەوە بە گەورەیی نووسرابوو(دوودیـنـار) ، لەو بەریشـەوە وێنەیـەك هەڵواسرابوو ، تەپو تۆزوچڵك رووخساری پێ نەهێشتبوو ، لەوە ئـەچوو سـەری زەلامێك بێت بسمـارێكی گـەورەی پیـا چەقیبێت . بۆگەنی ئاودەست خانەكەش بەراستی سەری گێژ ئەكرد . لەولاوە یەك دوو قەنەفە دانرابوون ، ئەوەندە كۆنو شكـاوو دڕاو بوون هــەر بۆ ئـەوە باش بـوو كەس لەسـەری دانەنیشێ . تەپو تۆز بەجـۆرێك نیشتبـوو هۆڵەكـەی تارپـك كردبوو و لەگەڵ هەموو بێ هەڵهێنانێكدا شوێن پێ ئاشكرا دیار بوو . لای دەرگاكەوە فەراشە سمێڵ زلەكە بەبێ تاقەتی قاچی خستبووە سەر یەك ، بڕۆ تەڵخە ئەستوورەكانی ئەوەندەی تر چاوە بچووكە زیرەكو فیلاوییەكەیان قووڵتر نیشان ئەدا ، كە نەخۆشەكە هـاتە ژووریٚ ئـەوەندە بـە ساردییـەوە ئاوڕی لێ دایەوە ، نەخۆشەكەی ناچار كرد بپـرسێت : عیادەی دكتـور فلان ئێرەیە ؟ - نا !

ئەمەی ووت گورج سەری وەرگێڕایەوە . گلۆپی سـەر دیوارەكە لە ناو تەپوتۆز وەنەوزی ئەدا ، نەخۆشەكـە وەكو بەهەشتی دۆزیبێتەوە گورج دانیشتو ووتی : لەناو قەڵە باڵفیو دەنگە دەنگی دراوسێو هۆڕنی هۆقەلییو فڕە فڕی ئوتومۆبیل ، نابەڵێ ساتێك بنووم و بحەوێمـەوە ، سەردێشـەش هەربـاس مەكە ، میوانی شەوو رۆژمە ، كاكە هەر ... !

- من هەر گوێی نادەمێ و تێرو پڕ ئەنووم .

فەراشەكە ئەمەی ووت و قسەكەی پێ بڕی و تاقەتی ئـەوەشی نەبوو سەری بۆ بەرز بكاتەوە .

- **بەختی خۆتە ، خوزگەم بەتۆ وا دیارە ناوچەكەتان بێ دەنگە !**
- **بێ دەنگ ! ناوچەی بێ دەنگ گوایە ماوە ! . لای ئێمە هەتا رۆژ باعە باعی مەڕومالاتیش لەبڕین نایەت !**
- **وادیارە خەو خۆش ! ئای !**

ئەمەی ووت و هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز كردەوە ، لەوە ئەچوو لای ئەو خەوخۆش گرنگترین بەخشندەیی یەزدان بێت . بۆیەكەم جار ئاوڕی لێ دایەوە ، بۆ ماوەیەكی كورت وەكو بیەوێ لە سەنگی بدات لێی وورد بۆوە ، پاشان بـەهەمـان ساردییەوە ووتی :

- نا هیچ خەو خۆش نیم ، بەس ئەوەیە لە جیاتی سەرم قاچم ئەخەمە سەرسەرین ، گوێچكەشم بەلۆكە ئەئاخنمو دەمم ئەبەستم و چاوێلكەیەكی رەشیش ئەخەمە سەر چاوەكانم .

كەسەر سـامی نەخـۆشەكـەی دی ، زەردەخەنـەیەك لێوەكانی كشان و بەروون كردنەوەوە ووتی : قـاچم ئەخـەمە سەر سەرینەكە تا ئەوە لەخۆم بكەێنم كە هەن سەرو قاچیان وەك یەكە ، دەمیشم ئەبەستم تا لە لووتەوە هەناسـە بدەم ، چونكە ئەگەر لووت هەناسەی پێ نەدەیت كاری چی یە ؟

نەخۆشـەكە بـە ئەبلەقییـەوە تێی ڕووانی ، ماوەیـەك وەستاو چاوەكانی ئەترووكان ، لەوە ئەچوو هـەوڵ بدات تێ بگات و پرسیـارێك بكـات ، دووایی ووتی : هەمـووی لەسەر

سەرم بەس چاوێلکە بۆ لەچاو ئەکەیت ؟

بزەکەی سەر لێوی فەراشەکە زیاتر لەجاران کشا ، دانەکانی هەموویان تەواو بوون ، لەوە ئەچوون بەدەست ریز کرابن . بە هێواشی ووشەکانی جوو و وەلامی دایەوە : تا لەخەوما کەس نەبینم . نەخۆشەکە داچڵەکی ، لەوە ئەچوو هەستی کردبێ لەگەڵ شتێکدا دانیشتبێ ، یان هەستی بەوە کردبێ پێی رائەبوێرن بۆیە خۆی کۆ کردەوەو بە تەوسەوە ووتی : قسەکانت خۆشن !

- **قسەکانی من هەروازبێنە ! ئەی ئەگەر گوێت لەقسەکانی جەنابی پزیشک بێ چی ئەڵێت ؟**
- **ئەویش وەک تۆ قسەخۆشە ؟**
- **کاکە هەربلس مەکە ، یەک سەعات قسەی خۆشت بۆ ئەکات ئینجا دێتە سەر ئەوەی بفەرموێ دایکەنە !**
- **چی ؟**

وەک گوللە توپ لەدەمی هاتە دەرێ ، بێ ئەوەی بشڵەژێ ، لەسەری رویشت و ووتی :

- **بڵێ کراس وفانیلەکەت داکەنە !**

**هێشتا لە دووا ووشەدا بوو ، نەخۆشەکە هەستا ، جێ شوێنی دانیشتنەکەی دیار بوو .**

- **بۆ کوێ !**
- **بۆ ماڵەوە ... چاک بوومەوە .**

**- ٢ -**

چوبووە ژێری ، برژانە تەڵخە ئەستوورەکانی بەرد ئەبوونەوەو بە داخەوە نزم ئەبوونەوە ، ئەو رۆژانەی هاتەوە یاد ، لەگەڵ جەنابی پزیشکدا منال بوون و لە قوتابخانە یارییان ئەکرد . مامۆستاش (سەرێکی پڕ لە داخی راوەشاند) دەستی ئەدا بە پشتیاو پەنجەی بەناو قژەمچلکنەکەیدا ئەهێناو ئەیووت : لە هەموویان زیرەک تری ، لە هەموویان زیرەک تری ! هەژاری بکەرە پێپلکەیەکو پیایاسەرکەوە هەرچەند بیری لەو مامۆستایەی ئەکردەوە یەکسەر چاوی بۆ ئەو وێنەیەی ناو هۆڵەکە بەرز ئەکردەوە ، هەموو جار وای ئەزانی ئەو کەللەسەرە ، سەری ئەوەو بزماری پیادا ئەکوتن ، هەر کە دەنگی کردنەوەی دەرگاکەی بیست پری کرد بەشرینقەیەکدا ، خێرا لەسەر ئاگر دای نا ، نەخۆشەکە دانیشت و ووتی :

- وا دیارە دەرزی بۆ نەخۆشەکەی ژوورەوە ئەکوڵێنی ! مامۆستا ، ببوورە ، هەژاری ئەگەر پەیژە دروست بکات ئەوە بەرەو خووارەوە ئەبیات !
- ها .. ئەڵێی چی ؟

داچڵەکی و گورج وەلامیدایەوە : نا کاکە !

- وا دیارە پزیشکێکی بێ هاوتایە ، لەوانی تر ناکات ، ئەوانەی یەک دەرزی ئەکەن بە دەکەسدا .
- نا .. کاکە ،

ئەمەی ووت و نیوە ئاوڕدانێک ئاوڕی لێ دایەوە ، خێرا خستی یە ناو تەرازووی چاوە قوولە زیرەکانییەوەو لەسەری رۆشت :

- جەنابی پزیشك ،

هەرچی بێتە لای دەرزییەکی پیا ئەکات .

- چی ؟ چۆن ؟ ئەوە ئەڵێی چی !
- بەس چۆن دەرزییەک ، هەمووی ئەباتە ناوەوە ، تا سەر ئێسکی ئەبات .
- شتی وانییە ، نەخۆشی وا هەیە پێویستی بە دەرزی نییە .
  - نا ئامۆزا ، ئەمدەرزی خۆی ئەوەشێنێ .
  - ئاخر نابێ ، کاکە نابێ ، من زەغتم هەیەو زەغتیش دەرزی ناوێ
- دوێنێ کابرایەک هات ، زەغتی زۆر بەرز بوو ، بەلام قورئان بەهەقە یەک دەرزی پیا کرد ، قریشکەی ئەو قوڕبەسەرە گەیشتە کەشکەڵانی فەلەک .

نەخۆشەکە بە دڵ خۆشییەوە ووتی :

- دوور نییە ، بەس من زەغتم کەمە .

تەواو ئاوڕی دایەوە ، دڵ خۆشی یەکەی ئەوەندە ناشرین ئەینوان کانی بەزمیی ئەتەقاند ، بەهێواشی ووتی :

- دەیسا بە گەورەیی خووا ئینجا دوو دەرزیت پیا ئەکات .

نەخۆشەکە خۆی گەیاندە دەرگاکە .

- خوای گەورە .

ئەمەی ووت و جارێکی تر سەری بۆ وێنەکە بەرز کردەوە . (ئەم تەماڵە وولاخیش بێ مەسەبێرن) . مامۆستا ئەمەی بە جەنابی پزیشک لە منالیدا ئەووت . بەهێواشی لەسەر

کورسییەکە دانیشت ، هەتا پێی کرا قاچی راکێشا ، ئەگەر پێی بکرایە سەد ئەوەندەی تر .. هەزار .. ملیون .. ملیار ئەوەندەی تر رای ئەکێشا ، تا ئەگاتە ئەوشوێنەی ئەوە ئەهێنێ بیخاتە سەر رووی .

- ٣ -

ناوچەوانی ووها هێنابووەیەک ، ئەوە نەبوو قژی لەسەر لووتی نەنیشێ . کەبۆ جاری سێیەم دەرگاکە کرایەوە ، بە ئەوپەڕی بێ تاقەتییەوە ئاوڕی دایەوە ، حەزی ئەکرد کەس ، هیچ مرۆڤێك بەدی نەکات ، ئەیویست بێتە بەشێک لەدیوارە چڵکنە تۆزاوی یەکان . نەخۆشێکی بەدی کرد ، وەک دووەمەڵ لە سمتی هاتبێ بەئاخ و ئۆفەوە دانیشت . دەستی برد شاقوولێکی بچووکی هەڵگرت (ئەم جۆرە شاقوولانە ئەخرێنە ناو سکەوە بۆ تاقی کردنەوەی ورگ و جەرگ و زراو) . نەخۆشەکە ماوەیەک سەیری شاقوولەکەی کرد و ووتی : وا دیارە خانوو دروست ئەکەیت ؟

- پف ،

بێ ئەوەی لێ بداتەوە ئەمەی بە قیزەوە ووت و دواویی لەسەری رۆیشت : ئێمە مانان و خانوو دروست کردن ، پف ، خووا بکات لە ژێرخانەکە دەرمان نەکەن .

- وادیارە بۆ دکتورە ؟

لاڵیوی بە تەوسەوە خووار بوو : ئەو ؟ چەند سێ چووار نۆمییەکی هەیە !

- ئەی ئەم پاک کردنەوەی شاقوولەت بۆ چی یە ؟
- بۆ جەنابی دکتور ، هەر کەسێک بێتە لای لە دەمو گەروویەوە رایەڵی ئەکاتە ناو سکییەوە ، بەوەش نەخۆشییەکەی بۆ دەرئەکەوێ هەستیکرد درۆ ئەکات ، دڵنیا بوو لەوەی جەنابی پزیشک بەو جۆرە سەیری ئاشکرا دیارە ، بۆیە رووی وەرگێڕا .

بەڵام نەخۆشەکە سەری سووڕماو بە ئەو پەڕی گێلییەوە تێی رووانی و دووایی ووتی : بەس زۆر نەخۆش هەن پێویستیان بەمەنییە !

- ئەمە بەجەنابی پزیشک مەڵێ .. ئەزانی ... ؟ ئای خووایە هەر ئەم نەخۆشەی ئێستە لە ژوورەوەیە ، بۆ ئەم نەخۆشە ناچار بووم زەلامێک لە دەرەوە بهێنم ، بە جووتە گرتمان و جەنابی پزیشک ئەمەی تووڕدایە ناو سکییەوە . یاخووا هەر دوژمنم بەو قوڕبەسەرە بێت هەر باسی هێلنج و پژمین و لیک مەکە ، ئاوو بەدەم و لووتیا ئەهاتە خوواریی و وەک ووڵاخ ئەیبیرمان ، ئەوە نەبوو چاوەکانی نەیەنە دەرێ . قوڕبەسەرە لە تاودا لەهۆش خۆی چوو ، رەنگە ئێستە هاتبێتەوە سەر خۆی .

نەخۆشەکە بەترسەوەو بە زەحمەت خۆی جووڵاندو ووتی :

- ئەمە بۆ من نییە ، من مایە سیریمە .

فەراشەکە دەسێکی بەلووتیا هێنا وەک بیەوێ ، بۆنی ئاودەست خانەکەی بە لووتدا نەچێو ووتی :

- مایەسیری ؟ مایە سیریتە ؟ با یەزدان پاڵ پشتت بێت ، دەست ئەدەم بە قورئانا ئەوسا لە خووارێشەوە بۆت رایەڵ ئەکات .

نەخۆشەکە هەر ئەوەی پێ کرا خێرا راست بووەو رای کرد . پاش ماوەیەک پزیشک لە ژوورەکەی هاتە دەرێ . باوێشکێکی بێ تاقەتی سەر لێویدا پۆشیو ووتی .

- ئەگەر وا بڕوات ، نابووت ئەبم ، تۆبڵێی نەخۆش نەمابێ ؟ باشترە پای دۆستی لێ بکەم .

ئەمەی ووت و بە رووخسارە پڕ گەوجێتییەکەیەوە چووە دەرێ .

فەراشەکە خێرا راست بۆوە وگورجێتی یەکی خێرا هەموو ئەندامەکانی لەشی داگرت و ووتی :

- نابووت ئەبی نابی چش ، دای خە ، دەی دایخە ، مەرج بێ لە شوێنی ناوەکەی تۆ ناوی خۆم هەڵواسم ! بۆ نا ؟ ئەتوانم وەک تۆ دەرمان بە نەخۆشەکان بدەم . خۆ ئەگەر مردیشن ئەوە یەزدان لەو دنیا لێ بووردنیان پێ ئەبەخشێت .

سەیرێکی وێنەو کەللە سەرەکەی کردو دەستی برد چراکان بکوژێنێتەوە ، بەڵام لەناکاو وەستاو بەرەو دەرگاکە رۆیشت .

٢٦ / ١١ / ١٩٨٠

« ئەرخەوان »

# خۆم نەکوشت

منداڵ بووم ، دایکم سینی یەکی ئەهێنا لە تێ نان و جامێ ئاوو هەر خواردنێکمان هەبوایە ئەیخستە سەری و ئەیدایە دەستم و ئەیووت ـ ئەوە بەرە بۆ مامە وەیس .

منیش سینی یەکەم ئەبرد لەبەر دەمی مامە وەیس دام ئەنا ، کە لە ژێر دارتووەکەدا بە کزی و خەمباری دائەنیشت و هەمیشە لە دەریای بیرکردنەوەدا نوقم بوو . مامە وەیسی ریش سپی و گۆچانەکەی و سەرو سیما خەمبارو چاوەکزەکانی ، دانیشتنی ژێر دارتووەکەی ، دیمەنێك بوو چاوی گەورەو بچوکی ئەو ناوەی پێ راهاتبوو . هەموو بەیانیەك مامە وەیس بەلەرزە لەرز خۆی ئەدا بەسەر گۆچانەکەی داو بەرەو ژێر دارتووەکە ئەهات و بە نرکەو ناڵەوە لە ژێر دارتووەکەدا خۆی ئەدا بەزەوی دا . سەرمای زستان و گەرمای هاوین کاریان تێ نە ئەکرد . لە بەیانیەوە تا ئێوارە لەوێ دائەنیشت و شەوانەش ئەچووە مزگەوتە ئەنووست . خێرو مەندەکانی ئەو ناوە جل و بەرگ و خواردنیان بێ ئەبەخشی . خەڵکی ئەو ناوچەیە هەموو خۆشیان ئەویست و رێزیان لێ ئەگرت و بەزەییان پیا ئەهاتەوە .

بەسەرهاتی مامە وەیس لە هەمووماڵێك و گوێ ئاگردانێکا بەسەدان جار گێڕابوویەوە . خۆشی هەموو رۆژێك وەکو فلیمی سینەما لە بیرو مێشك و دڵ و دەرونیا لێ ی ئەدایەوە هۆن هۆن فرمێسکی ئەرشت هەموو جارێ باوکم ئەیووت :

« وەیسەی هەژار ، کە هاتیتە ئێرە لاوچاکێکی ئەسمەری خوێن گەرم بووی . تەمەنی شیرینی لاویت بە ئەشکنجەو سزاوە بە نامۆیی لە ژێر ئەم دارتووەدا بەسەر بردو بوویتە ئەم پیرەمێردە رزیوە »

لەگەڵ ئەم قسانەی باوکمدا ، بەسەرهاتەکەی مامە وەیس رای ئەکێشام و قسەکانی لە گوێما ئەزرنگایەوە کە ئەیووت :ـ

- من و دارتووەکەو پەنجەرەکەیان بوویتە سێ دۆستی گیانی بەگیانی ... شەش مانگی رەبەق لە ژێر دارتووەکەدا دا ئەنیشتم و چاوم ئەبریە پەنجەرەکەیان بۆ ئەوەی لە ناکاوێکا چاوم پێ ی بکەوێ . کە هاتمە ئێرە چاودێری کۆمەڵە کرێکارێك بووم خەریکی دروستکردنی شوشتەو شەقام بوون . کەیەکەم جار بینیم ، بەیانیەك بوو ، پەردە سوورەکانی لاداو پەنجەرەکانی کردەوەو سەیری گۆڕەپانەکەی کرد چەو جوڵ و بزوتنەوەو دەنگە دەنگی کرێکارو هەرای ئامێرەکان ئەو ناوەی خرۆشاندبوو . لەبەر پەنجەرەکا وەستا بە جۆرێ سەرنجی هەموو کرێکارەکانی راکێشا ... جوانێك بوو جۆکی بە شاجوانی دنیا دا ئەدا ... کرێکارەکان دەستیان بە ئیشەکەیانەوە وشك بوو . هەتا دەنگی من دایچڵەکاندن :

- کاکە ، ئیشەکەتان !!

ئێوارە دەستمان لە ئیش هەڵگرت . چووینەوە بۆ ئەو جێ یەی بۆیان تەرخان کردبووین ... هەموومان نامۆ بووین و کەسمان نە ئەناسی .. پێکەوە لە خانویەکدا ئەژیاین .. ئەو شەوە باس هەر باسی (جوانی بەر پەنجەرەکە)بوو .

بەیانی کە گەراینەوە سەر ئیش کرێکارەکان و خۆشم چاوە چاوی ئەوەمان بوو پەردەکان لا بڕێ و جوانەکەی دوێنێ دەرکەوێ . کاتێ پەردەکانی لاداو پەنجەرەکەی کردەوە وەستا . ئەوەی جێ ی سەر سورمان بوو تەنانەت خۆشم بڕوام نە ئەکرد ئەوەبوو کە بە تەنیا سەرنجی منی ئەداو بزەیەکی ناسك سەرلێوەکانی تەنی بوو ... ئەو چەند سەیری منی کرد منیش هەروا چاوم لێ نەترووکان . هەر چەند کرێکارەکان ئەیان ووت :

- ئەوە چی یە ؟ بۆ وا سەیری ئەکا ؟
- ئەی ئێمە چین ؟

- ئا کاکە هەر ئەوی بەدڵە .
- ئا کوڕە فریای کەوە قسەیەکی لەگەڵ بکە .
لە نێوان ئەم قسانەی کرێکارەکان‌و سەیرکردنە چرەکەی ئەودا شڵەژاەو بۆ یەکەم جار رووم کردە ژێر دارتووەکەو لەسەر کۆمەڵە چەوێك دانیشتم . پەلە جگەرەیەکم داگیرساند‌و شڵەژاوی خۆمم پێ فەراموش کرد . بەڵام لە ناخما هەستم بە خۆشیەك‌و سەرکەوتوییەك‌و هەستێکی نهێنی ئەکرد .

شەوی ئەو رۆژەم لە نێوان دوکەڵی جگەرەو توانج‌و پلاری کرێکارەکانا بە رۆژ کەیاند . بەیانی کە هاتینەوە سەر کارەکەمان هەر لە دوورەوە چاوم بڕیبوە پەنجەرەکە ، کە دیم وەك خەرمانی گوڵ لە پەنجەرەکا وەستا بوو دڵم یەکەم خورپەی خۆشەویستی خستیە پەل . بە نیگا هێمنە خەمبارەکانیەوە سەرنجی دام‌و منیش سەرنجم لێدا .... هەموو کرێکارەکان کپ‌و بێدەنگ سەیری ئەم شانۆگەری لەیەك روانینەیان ئەکرد .

ئیتر بوو بوو بە پیشەمان ، ئەو هەموو بەیانیەك پەردەکانی لا ئەداو ماوەیەك لەبەر پەنجەرەکە ئەوەستا منیش لە ژێر دارتووەکەدا ئەوەستام‌و سەیری یەکتریمان ئەکرد .

کرێکارەکان دوو بەرە بوون ، بەرەیەکیان باوەریان وابوو ئەو کچە ، ئافرەتێکی خراپەو بەدوای رابواردنا وێڵە ، بەرەی دووەمیش بروایانە بەوە بوو کە ئەو کچە مەبەستی خۆشەویستیەکی راست‌و پاکە بۆیە تەنها سەیری یەك کەس ئەکا . منیش لە نێوان راستی‌و گومان‌داو لە نێوان قسەی کرێکارەکان‌و سەیر کردنەکانی ئەودا دامابووم بەڵام لە دڵا خۆشم ئەویست .

وورده وورده خۆشم‌ویست ، خۆشەویستیەك ئاگری لە ناخی دڵ‌و دەروونما هەڵگیرسان . ئەگەر رۆژی چەند جار ئەم دیایە شێت ئەبووم . هەر ئەو ساتەی ئەم بینی زۆتر بیرم ئەکردو زۆرتر پەرۆش بووم جارێکی کە چاوم پێی بکەوێتەوە ، دووراو دوورش بوایە هەر دڵم ئۆقرەی ئەگرت .

هەموو شەوێك هەزار رێگەو پلانم دا ئەنا بۆ ئەوەی سبەینێ قسەی لەگەڵ بکەم‌و رازی دڵی بۆ باس بکەم‌و بزانم ناوی چی‌یە ، بەیانی نەم ئەتوانی تەنیا قسەیەکیشی لەگەڵ بکەم .... هەموو پلانەکانم بێ سوود دەر ئەچوو ، چونکە هەرگیز لە ماڵ نە ئەهاتە دەرێ ، تەنیا لەو پەنجەرەیەوە جار جار دەر ئەکەوت‌و ئاوا ئەبوو . ماوەیەکی زۆر تێپەڕی ، هەر سەیری کردم‌و سەیرم کرد ، سەیر کردنەکانی بەهەشتێ بوو دڵی تیا ئەسرەوت . خۆشیەکی پێ ئەبەخشیم مەگەر هەر خۆم لێی تێ بگەم . نیگای چاومان یەکی ئەگرت هەموو فریشتەکان کرنوشیان بۆ شکۆی خۆشەویستی ئەبرد ... هەموو کرێکارە چەقاوە سوو گاڵتە بازەکانیش سەری رێزیان بۆ شکۆی ئەم عەشقە پیرۆزە دا ئەنەواندو کپ ئەبوون . شەوانە هانیان ئەدام قسەی لەگەڵ بکەم ، گاڵتەیان پێ ئەکردم ئەیان ووت : لێت بۆتە قەلاو بۆت ناگیرێ ، کوڕە ئەمە چ دڵداری‌یەکە ، دە قسەیەکی لەگەڵ بکەو بزانە کێ‌یە ؟ چی ئەوێ ؟

رۆژێ بریارم دا هەر چۆنێك بووە ، ئەچمە بەر پەنجەرەکەو قسەی لەگەڵ ئەکەم ، پەنجەرەکە لەسەر شەقامەکە بوو نزیکەی مەترێك بەرز بوو . چوومە بەر پەنجەرەکە وەستام هەر پەنجەرەکەی کردەوە چاوی پێم کەوت ، پێکەنی ... بە پەلە پێم ووت : بەیانیت باش چۆنی ، سەرێکی جوڵاند‌و پێکەنی - وەکو ئەوەی لە یەکێ بترسێ کشایەوە دواوەو نەمتوانی لەوە پتر قسەی لەگەڵ بکەم .... بەڵام ئەو تەنها ووشەیەو ئەو سڵاوو خەندەیەی .. بە جۆرێ دڵخۆشی کردم وام ئەزانی لە من بەختیار تر لە دنیادا نیە .

ئیدی هەموو بەیانیەك دەستم بەرز ئەکردەوەو بەدەم جوڵانێك ئەم ووت چۆنی .. ئەویش پێئەکەنی‌و بەسەر سەلامەکەی ئەسەندەوە هەموو خواستێکم ئەو سڵاوو پێکەنینەی بوو ، ئەو نیگای چاوانەی بوو کە بەو پەڕی سۆزو خۆشەویستیەوە ئاراستەی ناخی دڵی ئەکردم ، ژێر دارتووەکەو پەنجەرەکەیان هەموو دنیام بوو ، کرێکار لە هەر لایەك ئیشی بکردایە من هەر ژێر دارتووەکە جێم بوو یا چەند جار لە وێوە ئەهاتم‌و ئەرۆیشتم .

منی شەیدا سەودا سەری عەشقە جوانی بەرپەنجەرە بووم نەم ئەزانی رۆژ چۆن تێئەپەرێ‌و شەو چۆن دادێ .. کات‌و شوێن هەمووی لە لام توابووەوەو تەنها کاتی دیاری‌کراوم کاتی دیداری ئەوبوو ... تەواوبوونی کارەکەمان نزیك بووەوە ئەبوایە بگەڕاینایەوە بۆ شارەکەی خۆمان . بەجێهێشتنی شارەکەی خۆم‌و ژنەکەم‌و کورەکەمم وەکو خەو ئەهاتە بیر کە

بەجێم هێشتن بە فرمێسکەوە خوا ئاگاداریم لێکردن بەڵێنم دانێ هەموو مانگێ بە کوڵێ تاسەو خۆشەویستیو مانگانەکەمەوە بچمەوە بۆ لایان ، کەچی شەش مانگی کارەکەمان تەواو بوو تەنیا جارێکیش نەچوومەوە بۆ لایان ، بە هاورێکانیشما پارەم بۆ ئەناردنەوە .

ئیشەکەمان تەواوبوو . بریاربوو دوای دوو ڕۆژ بگەڕێینەوە . خەمو پەژارە دایگرتمو ئەژنۆم شکا . چۆن بتوام بەجێی بێڵم ... ئەو شەوە بڕیارم دا . بەهەر نرخێك بووە چاوم پێی بکەوێو قسەی لەگەڵ بکەمو خوا ئاگاداری لێبکەمو چارێكو ڕێگایەك بۆ خۆمان بدۆزینەوە .

شەوێکی ساردی زستان بوو هاتمە دەرێ و بەرەو ماڵەکەیان کەوتمە رێ . لەتاو ئاگری عەشقی دڵم هەستم بەسەرماو سۆڵە نە ئەکرد . گەیشتمە بەر پەنجەرەکە .. کەمێك وەستام ، دڵم لە سینەمدا خۆی نە ئەگرت .. خۆشەویستی هەموو شتێکی لەبیر بردبوومەوە . بەردێکم گرتە پەنجەرەکە . پیرێژنێك پەردەکانی لادا خۆم خستە تاریکیەکەوە .. پاش کەمێك خۆی هات لە تەنیشت پیرێژنەکەوە وەستاو سەیری دەرەوەیان ئەکرد پیرێژنەکە ڕۆیشت خۆی هەر وەستا . چوومە ژێر ڕوناکی گڵۆپەکە ، چاوی پێم کەوت . بەدەست ئیشارەتم بۆ کرد کە بێتە دەرێ . پەردەکانی دادایەوەو وون بوو . نەڕۆیشتم ، هەردوو وەستم غستە گیرفانی پاڵتۆکەمەوەو چوومە ژێر دارتووەکەو کەوتمە هاتووچۆ کردن . چەند جار پەردەکانی لاداو سەیری کرد هەر لەوێم پەردەکانی دا ئەدایەوە .

لە ناکاو تارماییەکم بەدی کرد بەرەو ڕووم ئەهات . کە گەیشتە ئاستی گڵۆپەکە ، لە جێی خۆم ووشك بووم . دڵم کەوتە پەلە پەل قورگم ووشك بوو ، هێندەی نەمابوو ئەژنۆم شل بێتو بکەوم گەیشتە بەردەمم هێندە شڵەژابووم بڕوام نە ئەکرد ئەوەی ئەی بینم ڕاستە یا خەوە . خۆشەویستەکەم بە چاوە سەوزەکانیو برچە زەردەکانیەوە وەکو مانگ لەبەر دەمما ئەدرەوشێ . بەپەلە ووتم :ـ بەخێر بێیتو چۆنیت ر باش بوو هاتیت ئەگینا ئەمشەو تا بەیانی لێرەدا ئەوەستام .

هەر بەچاوە گەشەکانیەوە بێدەنگ سەرنجی ئەدام قسەی نە ئەکرد هەموو ڕازی خۆشەویستی خۆم بۆ دەربڕیو ناوی خۆم پێووت ناوی ئەوم پرسی هەر وەڵامی نەدامەوە .

دەستیم گرت نام بەسنگمەوە ، ئەویش دەستەکەی کەی خستە سەردەستمو چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك .

ووتم بۆ قسە ناکەی ؟ بۆ وەڵامم نادەیتەوە ؟ سەری خستە سەر سنگمو دەستی کرد بە گریان فرمێسکەکانی سەر سنگی تەر کردم . فرمێسکەکانی منیش بە سەر پرچەکانیا هاتە خوارێ . پاش کەمێك سەری بەرز کردەوەو بەدەست تێی گەیاندم کە نە هیچ ئەبیستێو نە قسەش ئەکا ـ کەڕو لاڵە ـ بەهەموو هێزم نام بە سنگمەوە ئاواتم ئەوەبوو هێزێکی ئەفسانەیی بمان کاتە دوو پەیکەرو هەتا هەتایە لەوێ دا بمێنینەوە .

نە ئەو لە قسەکانی من گەیشت و نەمن لە ئیشارەتەکانی ئەو بەڵام لە چاوەکانیا پیرۆزترین خۆشەویستیم خوێندەوە .

« خۆشەویستی پەیامێکە دڵ ئەینێرێ بۆ دڵو چاو رای ئەگەیەنێ پێویستی بە قسە نیەو هیچ بەرەڵستێکیشی نیە »

هەردووکمان لە دەریای عەشقێکی مەزنو پیرۆزا نوقم بووینو سەرنجی یەکمان ئەدا ، دەنگی چەند گوللەیەك دڵی ڕاچڵەکاند کە ڕوانیم خۆشەویستەکەم کەوتە سەر زەویو خوێنەکەی ڕژایە سەر خاك هەر کە ئەو دیمەنەم بینی بەرچاوم ڕەش بوو ئیتر نازانم چیم بەسەر هاتو چی ڕووی دا .

کە چاوم کردەوە لە ژووری مزگەوت کەوتبوومو چەند خێرومەندێك لە دەورم بە خەمباری دانیشتون . هەستامو بەهەر حاڵێك بوو خۆم گەیاندەوە ژێر دارتووەکە . خوێنەکە هەر مابوو خاکو خوێنەکەم کرد بەسەر خۆماو شیوەنم کرد . هەرچی ئەو ناوە بوو لێم کۆبوونەوەو بەزەییان بە حاڵما ئەهات .

لەو کاتەشدا ماڵەکەیان ئەگوێزرایەوە بۆ شوێنێکی نادیار . «من دام بەکوشت» خۆم ئەکوشت بۆ ئەوەی سزای خۆم بدەم خۆم ئەکوشت تا داستانی عەشقی ئەمر بێو هەمووشەوو ڕۆژێك بیگێڕمەوە بۆ خەڵکی تا بزانن کە چەند بەڕاستیو بە پاکی خۆشم وسیتو هەتا مردنیش هەر خۆشم ئەوێ ....

ئەمە بەسەر هاتەکەی مامەوەیسە ، ئێستا کە گەورەبووم ئەزانم کە خۆشەویستی مەزن ئەوەیە ئەمر بێو ئەگۆڕێ وەك ئەم عشقەی مامەویسە . تەنانەت ڕای سپاردوە کە هەر کاتێ مرد لەژێر دارتووەکەدا بینێژن .

سلێمانی ١٩٨٢

عەبدوڵلا سەڕاج

# پەڵەکێن

- ١ -

( دەرگا - دانیال - دیوار - دەنگ - درۆ )

دەرگایەك دەر دەكەوێ كە پێشووتر بە سەوزێکی کاڵ بۆیە کراوە . کەس نەبوو لەو کوزەرەدا سۆڵی محێدین نەناسێت . لەو سەوزە کاڵە تەنیا چەند پەڵەیەك ؛ لێرەو لەوێ نەبێ ، ئەگینا دەرگاکە زەنگاویی خۆی دەنواند . سۆڵی محێدین کە لە دەرگا سەوزەکەوە دەهاتە ئەم دیو منداڵان خۆیان لێ مەڵاس دەدا نەبادا وەك بریشکە ، دزوێن بە کەسو کاریان بدات یان یەکێکیان بگرێو مارکوژی بکات . « ئەم بێوڵەی بەرازانە خۆ خەریکن بەرد لە بەرسیلەو هەناره نەبەکامەکانی ماڵی حەمەشین دەگرن ! حەرامزادەن ... زوڵن ، نانیان دەدەدەنو ... » .

دەرگاکە هەمیشە وازە بوو ، دوو ریز بزماری کۆپکە داری زەنگن ، هەرچەندەش لە چەند لاوە ، بزمارەکان نەمابوون لە جێگایاندا ، کونی گەورە مابووەوە ، کونەکانیش بەقوڕە سوور پڕ کرابوونەوە ، ئەمە گشت ئەوەیان دەسەلماند کە پێشووتر دەرگای ژوورەوە بوو بێت . سۆڵی محێدین کورتە بنەیەکی ریش تۆبزی ماش و برنج بوو ، بەلام تێکەو لێکەی ژیان بەشی برنجەکەی دوو هەندەی ماشەکە لێکردبوو ، سۆڵی سەڵتەیەکی قاوە ڕەنگی لەبان کەوا میل میلە زەنگ ڕەنگەکەی لەبەر دەکرد .

دیوارێکی خشتی سوور دیارە ئەمیش باران کاری خۆی پێکردبوو ، بە ڕەنگێك لە زۆر لاوە کەل بوو ، بێجگە لەوەی کە قەڵپکە کای ناو خشتەکان وەکو دەرزی پێشوازییان لە ناو لەپی منداڵان و شانی هامشۆ کەران دەکرد ، سەرەڕای ئەوەش لە شەقاوێك بەولاوەی دەرگاکە ، دیوارەکە زگێکی ئەوتۆی دابوو کە مایەی مەترسی بوو لەو کۆڵانە ناهەموارو تەنگەدا .

ئەوانەی بە مەرگی پوورە «چیمەن» یان زانی زۆر کەم بوون ، ئیتر سۆڵی محێدین ئەرکی کۆڕستانیشی کەوتە ئەستۆ . خۆ هەرچەندەش لە پوورە چیمەن وەچی نەخستەوە ، وەلێ دەگێڕنەوە گوایە لە گرانییەکەدا کوڕو کچێکی لە ژنە ئەرمەنییەکەی هەبووە ، ئەوسا دوای سەفەربەلك ، لە مانگێکدا بەر دروێنەی ئاوڵە کەوتوون . سۆڵی محێدین دەسڕۆ نەبوو ، جاران بنێشت و دەرزی و بخوورو سنجاق و قوتووی بەتاڵی دەفرۆشت «ئەو ڕۆژەم لەیادە کە بۆ یەکەم جار چاووم بە - کەص - کەوت لە خوارەوەی کەصەکە تەختەیەکی شەش پالۆو داندرابوو ، چەوری و گەرما سووری کردبوو ، لەبەر خۆمەوە ووتم : ئێستا تەختەیە چەند بە لەزەتە ئەگەر بیمژیت ... ڕۆژگارە ... ئای چیمەن گیان ...»

هەتاکو ئەم چەندانە ، کەوتە خولیای دەروێشی و خەرقە پۆشی ، ئەم گۆڕانەش وای لێکرد کە لە ئێش سارد بێتەوەو توندو تیژییەکەی پەرە بسێنێ ، هەتا ڕۆژێك سۆڵی شەش حەوت پەلکە گوڵاڵە سوورەی خستە سەر مەچەکە کوتراوەکەی و توند بەستای ، بۆ ڕۆژی دوایی ، جێگای کوتراوەکان وەك ئەوەی ڕۆنی هەڵقرچاوی بەسەرا ڕژابێت ؛ پێستەکەی داماڵدرا بوو «خۆ ئەگەر خاڵە ڕەشیدی بەربەر نەبوایە لێم دەبووە برینێکی تیراوی» سۆڵی هەر چەندەش کوتانی لەلا ئەنگی و پەشم بوو بەلام ئەموستیلە زیوە نقێم سەوزەکەی پەنجە تووتەی بە خەلات و خۆشنوودی شێخەکەی دەزانی ، سۆڵی تووکە سەری هۆن هۆن لە ژێر مێزەرەکەیدا دەشاردەوە ، تەزبیحێکی ناوکە زەیتوون هەمیشە بە ملییەوە تەکە تەکی بوو ، سەرەڕای ئەوەش دەنگی یا کەریم و حەی حەی پێش بیست هەنگاوی دەکەوت ، کە دەگەیشتە سووچی دیوارە رووخاوەکە

بسمیلایەکي دەکردو سەرنجی کونە زەردەواڵە کانی دەدا نەبادا منداڵە ورتکە ورووژاندبوونی دەرامزادانە جون جون سەلکە بزوتك دەئاخننە کونەکانو شەپۆلی زەردەواڵە هاتوچۆ کەران هەراسان دەکەن .. زوڵن ..»

لە لایەك دەبووە گەپو لاقرتێو بەزم ، لە لایەکی تریش دەبووە کوپچر کوپچڕێك کورم دەویست خۆی پێ پاس بکرێت .
یەکێك لەم منداڵانە یەخەی باپیری گرت :

- بابە گەورە ... ڕاستە ئەگەر چل نوێژی بەیانی لە مزگەوتي دانیال پێغەمبەری قەلا بکەیت ، خدری زیندە دەبینی !؟

بابە پیرە هەر هەندەی ووت :

- ئێستا بنوو ... درەنگە ..

- ٢ -

( خوا - خاسە - خدرزیندە - خانوو - خەییام )

هەر شتێك سپی ی دەنواند : ئاسمان .. هەورەکان .. کراسە چاوە دەڵبەکەی سۆڵی محێدین . ئاسمانو کۆڵانو شەقامەکان : بێ ورتە بوون . خرەکە بێ ورتە بوو ، نە میاوەی پشیلەیەك ، نە سەگوەڕێك ، جریکەی مەلێك .

ئەو بەربەیانە سۆڵی محێدین ، چلەمین جای بوو کە جاشکەوشەکەی لە پا هەڵکێشاو ڕێگای دانیال پێغەمبەری گرتە بەر . گوێچکە نانێکی بۆ پشیلە دە ستەمۆکەی دانا . دەم بە ویردەوە گەیشتە کۆشکەکەی قازی ، باوێشکێکی دایەوەو لەوێوەش شۆر بووە ناو خری خاسەوە . ئەمجا بە شێنەیی لە ئاوەڕۆیەکی دا کە پێشتر هەر خۆی چەند بەردە بازێکی بۆ دانا بوو . لەو پەڕەوەش ، ئاوڕی لە هێلی شەمەندەفەرەکە دایەوە ، منارە لارەکەی بەر تەکیە ، ئاشە خاپوورەکەی کۆشکي ، خانەقای سەید ئەحمەد ، ئیمامەکەی قەد قەلا ، مزگەوتي مەلا بامیە ، وەکو گشت بەربەیانێك ، بەدەم ڕێگاوە ، بە سەریاني کردەوە . پەڕییەوە بۆ لای سینەمای خەییام دەاجی خورشیدی حەلواجی ئەم سینەمایەی بنیات نا، هەرکەس نەحلەتیان بۆ دەنارد ، قازیش کە کۆشکەکەی کرد خەڵکی بە شێتیان زانی ، کەچی ... » لای سینەماکە پاکۆی ماندووبوونەکەی دایەوە . کەوتە ڕێ کردن ، هەتا خۆی لەسەر پلیکانەکانی قەلا دیت .

پرزەی لێبرابوو . دەستی برد بۆ بەرماڵەکەی سەر شانی ، هەناسەیەکی هاتەوە بەر ، سۆڵی وەك نهێنییەك پاڵي پێوە بنێ ، نە نوقرچی سەرما ، نە باجی ساتمەو هەڵدێرانو نە مەترسی ی شێلانو شتی تر ، هیچیان هاوسەنگی ئەوە ناوەستان کە ئەمڕۆ بە دیداری کەسێك شادو خوشنوود دەبێت . نوێژەکەی دابەست . ویستي بە هەموو توانـاو وزەو ماسولکەو شادەمارەکاني کۆتایی بەو ئەزموونەی بێنێ ، بۆیە لە فاتیحادا زۆر دواکەوت ؛ چەند جارێك وەك ئایەتەکاني لەبیر چووبێ ؛ پاشەو پاش بووەوە . ووشەکانی دەگەست ، خۆ لە خۆنوشتانەوەو کرنووش بردنەکانیشدا ، دەستە لەرزۆکەکاني بە ئەژنۆیا دەگرت نەبادا بەلایەکدا برمێ یان شەیتاني نەگریس هەڵەیەکی ئەوتۆی پێ بکات کە سەرجەمي دینداریيەکەی فت بکات . سلاوێکی ئێجگار سۆزاویی بەلای ڕاستا نارد . هەروەها سلاوێکی تریش بۆ لای شاني چەپ . ئەمجا بە کزییەوە هەر دوو لەپی جووت کردو ڕووی خۆی پێ سڕییەوە .

دوایی چاوە بە کلەکانی کردەوەو بەناو مزگەوتەکەدا سووڕی دان ، چونکە لە ناخەوە دەیویست بە دیداری خدر زیندە شاد بێتو گڕکاني هەناوی دامرکێو بگاتە پایەیەکی عیشقو سوتان . هیچي نەدیت ، تەنانەت نە زایەلەیەکی بیستو نەترپەیەکی ڕاگوزار ، بۆیە بە دڵساردییەکەوە ، دەستي بڵند کردەوە ، تەزوویەك بە لەشیا هاتو رایتەکاند ... زماني لە کۆ چوو ... خوێن زاییە چاوو ڕووی . نەیزاني لە چ حاڵێکدایەو لە ناکاو بە کوڵ گریا ، فرمێسکی تێکەڵ بە ریشە تۆپەکەی بوو ، تۆزێك فرامۆشیی هاتەوەو زماني دۆزییەوە . هاواری کرد :

- خدر زیندە .. هەی ئەستێرەی سیومیل ، کەی ناوچەواني سەوزو نورانیت زاخاوی دیدەکانم دەدات ؟ خۆ سوێم کرد ، کەی دەستە نەرمو شلەکانت ماچ دەکەم .. ئاواتم ئەوەبوو کە دوور بم لە نەوسو ئارەزووی لەش ، بەدەر بم لە چێژو هەستي شەیتان . دوور بم لە ئێش ، لە تینوویەتی ، لە برسێتي . دەمویست بمکەیت بە بەشێك لە خۆت . لەم گومڕاییە پەلم بگریتو ببم بە پارچەیەك لە سروشت ، بە ئاو ، بە با ، ببم بە درەخت ، بە مەل ، تەنانەت ببم بە تنۆکێك ، بە هەناسەیەك ، بە گەڵایەك ، بە پەڕێك ئەی

نووسینی : ئیدریس

# ئای .. ئای

احمد محمد اسماعیل لەتورکییەوە وەرگێڕاوە

هەرێمی «سوکابومی» بە هەرێمێکی سازگار فێنک ناویانگی دەرکردووە کەچی ئەو رێبوارانەی بۆ بلیتکڕین لەبەر پەنجەرەیەکی بچووکدا ریزیان گرتبوو ، لە گەرمانا وەخت بوو ببوورێنەوە . ئارەقەی لا مل و بن هەنگڵ و پشتیان وەك پەڵەیەکی تۆخ بە کەلوپەلەکانیانەوە دیاربوو . ریزەکە تا چاو بڕکات کشابوو . بەرپێ و ئەم بەرو ئەو بەری خەڵکە ریزبووەکە لەبەر مێش رەش دەمیپوانی ، لەوە دەچوو دەرمانێکی رەشت بەو ناوەدا هەڵڕشتبێ . لاوێکی وشکەوە بووی لەرولاوازی ناو ریزەکە بەردەوام دەکۆکی . ئەوەی لەپشتییەوە راوەستابوو لێی پرسی «بۆ دەکۆکی ؟! .. خۆ ئێرە خۆڵ و توزی نییە !» .

لاوەکە بە وەڵامدانەوەکەیا دیار بوو ئەم جۆرە پرسیارانەی پێ خۆش نییە : «لە ژوورێکی پاك و تەمیزیشم دانێن من ئەم کۆکەیەم هەر هەیە ... لە «پایەوەوە» هاتووم و بۆ «جاکارتا» دەڕۆم ..»

کابرا کە پرسیارەکەی لێکرد ، دەسەسڕێکی گرت بە دەم و لووتییەوەو دووبارە کەوتە قسەکردن «کە دەزانی نەخۆشی تف رۆمەکە ... نازانی ئەم جۆرە نەخۆشییە سارییە» .

لاوەکە دەستی بە کۆکە کۆك کردەوە ، بەدەم کۆکینەوە بەڵغەمێك کەوتە نێوان هەردوو لێوی . بەڵغەمەکە خاڵێ سووری تێدابوو . شروشیتاڵ لە بەرێکی ئەندەنووسیایی ـ پێشەوەی ریزەکەدا وەستابوو ، دەستی وەك قیرو چڵکنی کردبووە نێوان شیشی پەنجەرە . بچکۆلەکەوەو لەسەریەکەو بە دەنگێکی ناساز دەیگوت «بلیتێکی دەرەجە چوار بۆ جاکارتا ..... بۆ جاکارتا دەرەجە چوار» . بلیت فرۆشەکە چاوی لێ زەق کردەوە :

«گەر نیازی چاوەڕێ کردنت نییە لێرە مەمێنە» .

کابرای ئەندەنووسیایی هەر وەك لەگەڵ ئەویان نەبووبێ وەرامی «دایەوە» نیو سەعات رێکە چاوەڕێ دەکەم و هێشتا بەرێت نەخستووم ، کەچی ئێشی ئەو پیاوەت جێبەجێ کرد !!» مەبەستی کاربەدەستێکی «ستاسیۆنەکە» بوو کە لەپشت بلیت فرۆشەکەوە وەستابوو .

---

حذر زیندە لە کوێ ی ؟!

گڕی ئەوین و عیشق زمانی بەست . گشت ختورەکانی دڵی خنکاو مەستی بە هەڵچوونێك کرد لە ناو مێشکیا وەکو ئەوەی شتێکی بلوورین لە ناخیدا وردو خاش بێت یان وەکو ئەوەی مێخسکەیەکی تێدا بکوتن ، بۆیە نەعرەتەیەکی کردو ئیتر پەڕییە سەری .

خەڵکی شار ئێستاش ئەو رۆژەیان لە پێش چاوە کە سۆفی محێدین لا لغاوەی کەفی دەکردو پاپەتی و سەر قوتی و قەلەندەرانە ، کۆڵان و جادەکانی دەتەنی و دەیشیراند :

ـ کەی .. کەی . هۆ حذری سیوەیل ، کەی .. کەی .

دواییش کە هیمن دەبووەوە ، هەر بە خۆی دەگووت : ئای چەند بە لەزەتە ئەو تەختە چەورە .

خەڵکی شار هەرگیز ئەوەشیان لەبیر ناچێتەوە کە هەمان رۆژ شەستە بارانێکی وا رۆی کرد ، کردیان بە مێژووی لە دایك بوونی منداڵەکانیان ، هەر وەها هەورە تریشقە کەڕی دەبیساندو تەنانەت بروسکەیەکی بەسامیش دار زەیتوونێکی «گاورباخی»ی کردە کۆتەرەیەکی زوخاڵ ، بۆ شەوەکەشی ؛ مانگ وەکو دەمە داسولکە لە جەرگی ئاسمان چەقی بوو .

شوباتی / ١٩٨٢ کەرکووک

کابرای پشت بلیت فرۆشەکە بەسەریا نەڕاندی :

**«تۆ خەریکی کاری خۆتبە ، ئەمە پەیوەندی بەتۆوە نییە . هەر دەتەوێ زوو تر کارەکەت جێبەجێ بکرێ ، ئەوا تۆش وەرە ئێرەوە ، ئەمەش نیو روپیە زیادەی دەوێ ..»**

کابرای ئەندەنووسیایی مت بوو ، سەری دانەواندو بۆلەبۆڵێکی لێوە هات ، «لۆمەی ناکەم .. هەموو کەسێ دەیەوێ کونێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە» ئالەبەر خۆیەوە ئاوای گوتو چاوێکی بە جانتا پڕ برنجەکەیدا خشاندو لەژێر لێوەوە وتی «منیش دەمەوێ» .

لەم دەمەدا کابرایەکی «چینی» ریزەکەی بەردا ، بەدەم دەست سڕینەوە هاتە تەنیشت کابرای ئەندەنووسیایی یەوە . کابرای ئەندەنووسی خۆی لەبارێکی کەدا دەبینی وای دەزانی لە تەنگانەیەکی گەورە رزگاری بووە ، هەڵیدایەو وتی :

«تکایە ... تکایە ریزەکە بەرمەدەن ئەگینا خەڵکەکەش چاو لەئێوە دەکات ، دواجار دەبێتە گەڕە لاوژێو کاکی بلێت فرۆشیشمان لێ دەرەنجێ ...»

کابرای چینی «بە تەوسەوە پیایا هەڵیپڕوانی» برادەر ئەوەندە لە سەری مەڕۆ .. نازانی من کێم ؟! .. فەرمانی تێپەڕ بوونم لە کار بەدەستانی «جاپۆن»ەوە وەرگرتوە» . ئیمجا رووی لەکابرای بلێت فرۆش کرد : «بلێتێکی دەرەجە دوو بۆ جاکارتا» .

بلێت فرۆشەکە وتی «دەرەجە دوو بۆ جاپۆنیەکان تەرخان کراوە» . کابرای چینی تەماشایەکی پێنج روپیەکەی ناو مشتی کردو قاقا پێکەنیو هەڵیدایە «ئەمەش فەرمانی تێپەڕ بوونەکەم .. بلێتێکی دەرەجە دوو تاکو جاکارتا هەر بە دوو روپیەیە ، زێدەکەشی .......» .

بلێت فرۆشەکە پارەکەی مشتی قۆزتەوەو وتی :

**«فەرموو گەورەم ، ئەمەش بلێتێکی دەرەجە دوو بۆ جاکارتا» .**

شەمەندەفەر گەیشتە «مەحەتەکەی» سوکابومی . کابرای چینی لە یەکێ لە فارگۆنەکانی دەرەجە دوودا جێگایەکی بۆ خۆی گرتو لەگەڵ کچێکدا دەستی بەچاوبڕکێ کرد ... لە فارگۆنەکانی دەرەجە سێو دەرەجە دوودالەش لەبان لەش بوو ، هەندێکیان بە پێوە وەنەوزیان دەدا ، هەندێکی کەشیان ژاوەژاو و قەرەباڵغەکە کاسیانی کردبوو ، ئەوەندەی نەمابوو دەست بەگریان بکەن .

ئەو کابرایەی تەماشای بلیتی ریبوارەکانی دەکرد ، چووە فارگۆنێکی دەرەجە سێوە ، چەند کەسێك لە نزیك دەرگاکەوە بە تەنیشت شتو مەکەکانیانەوە راوەستابوون ، لێیان چووە پێشەوە ، «بلێتەکانتان» . لە جیاتی بلێت ، هەریەکە لە عاستی خۆیەوە دەستی بەگیرفاندا کردو هەندێ پارەیان بۆ درێژ کرد . کابرا وەك فیشەکە شێتە چووە ئاسماناو وتی «کە بلێت نابڕن بۆ سواری شەمەندەفەر دەبن ؟ .. چۆن خۆتان بەشەمەندەفەردا کرد ؟ یەکێ لە ریبوارەکان هاتەزمان «شتێکمان پیشاندانو رازیمان کردن» . کابرا ورتەی نەکرد . بەئەسپایی پارەکانی لێوەرگرتنو خستیە تەنگی باخەڵەوە ، یەکسەر چووە دۆخێکی کەوەو بەزبانێکی شیرین وتی «جارێکی کە بێ بلێت سواری شەمەندەفەر نەبن .. وانییە ؟ ..» .

شەمەندەفەرەکە لە «مەحەتە»یەکی بچووكدا راوەستا . چەند لاوێك سەرکەوتنە سەرەوە ، لەناوقەدیان بەرەو ژوور رووت بوون ، بە کاسکێتەکانی سەریاندا دیاربوون ئەمانە «کایبودانن»[1] .. ریبوارەکانیان پشکنی . بەلای هەر کەسێکەوە برنجیان ببینایەتەوە ئافرەتیش بوایە سەرومليان دەولاوی . لەسەر جێگایەکی بەتاڵدا جانتایەك برنجیان بینیەوە . یەکێ لە «کایبودانەکان» وەك شتێکی گرفگی دۆبێتەوە کەوتە هەواڵ پرسین «ئەمە هی کێیە .. ئەمە هی کێیە ؟»

تومەز جانتای پولیسێکە ، لەو لاوە بە هەڵەداوان پەیدا بوو «هی منە .. هی منە وادیارە نیازی دەست بەسەرا گرتنیت هەیە ؟!» سەلامێکی بۆ سەندو وتی «ببوورن .. وام زانی هی رێبوارەکانە» کایبودانەکان دابەزین ، ئەو برنجانەی دەستیان بەسەرا گرتبوو لە شوێنێکدا کۆمەڵەیان کرد ، یەکێ لە کایبودانەکان بە گوێی ئەوەی تەنیشتیا چرپاند «جەنابی بوراکاوا لێرەیە ؟» .. هاورێکەی سەری راوەشاند ، لە مەبەستی هاورێکەی گەیشت . بۆیە وتی :

**«خۆی ئامادە کردبوو بۆ «بوکار» بڕوات .. هەرچۆنێك ببێت بڕوا ناکەم پێش ئێوارە بگەڕێتەوە . برنجەکە دەکەینە چوار بەشەوە . ئەویشی پێ رازی دەکەین ..»**

لەم کاتەدا شەمەندەفەرەکە کەوتە ڕێ و «عەرەبێك» هاتە سەرەوە . کە چاوی بە قەڵەباڵغەکە کەوت ، یەك دوو جار لەبەر خۆیەوە ووتی «ماشاالله .. ماشاالله» . شرکە لە بەرێك لە پشت کابرای عەرەبەوە ڕاوەستابوو ، قاچێکی براوبوو ، بەدەست درنی بە خەڵکەکە دەدا ، فارگۆنەکەش دەرزیت تیادا هەڵدایە بەزەوی نەدەکەوت .

عەرەبەکە لە کابرای قاچ براوی پرسی «بۆ کوێ دەڕۆی ؟ دەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر بەم جۆرە ڕاوەستی ؟!»

کابرا وەك چاوەڕێی ئەوە بووبێ یەکێ پرسیارێکی لێ بکات گورج هەڵیدایە «بۆ جاکارتا دەڕۆم .. لەم کاول بووە کەس دەستی یارمەتیم بۆ درێژ ناکات ... بەڵکو لە مەحەتەی داهاتوودا یەکێ دابەزێ ....» .

لە فارگۆنێکی دەرەجە چواردا ، پۆلیسێك چاوی بڕیبووە ئافرەتێك . ئافرەتەکە پشتی کۆم دیار بوو . دوێن جوان ئاسایی هێواش خۆی لێ نزیك کردەوە . «ببورن تەمەنتان چەندە ؟!» ئافرەتەکە وەك کیسەڵ خۆی بردەناوەوەو ڕەنگی زەردهەڵگەڕا . «سی و دوو .. بۆ دەپرسن ؟!» ..

«هەروا .. چەند ستەمە ئافرەتێك لەم تەمەنەی تۆدا ئاوا کۆم بێ ! .»

چووە پێشترەوەو دەستی بە پشتیا هێنا .

«بەلام ... بەلام ئەم قۆقزییە هی کۆم بوون نییە» .

پاش کەمی تێڕامان ووتی «ڕاوەستە بزانم ... ئەمە برنجە ... وانییە» ... خۆشیم بە ئافرەتی کومدا نایەت .. وابزانم برنجەکە بخەینە جانتاکەی منەوە قازانجتە .. کە گەیشتینە جاکارتا دەیدەمەوە دەستت .. خەم مەخۆ کایبۆنەکان پێت بزانن ئازارێکی زۆرت دەدەن ...» .

پۆلیسەکە قاقایەکی ناقۆڵای بۆکرد ، ئافرەتەکەش کە برنجەکەی لە ژێر کەڵوپەلەکەیەوە دەردەهێنا ، ئەوەندەی نەمابوو لەشەرمانا بتوێتەوە . دەریهێناو ئاخنیە ناو جانتای پۆلیسەکەوە .

لەنزیك «بوگور»دا ، شەمەندەفەرەکە پێچی کردەوە ، کابرای قاچ براو لەنزیك دەرگاکەوە ڕاوەستابوو خۆی بۆ نەگیراو کەوتە خوارەوە . یەکێك زەنگی ڕاوەستانەکەی ڕاکێشا ... حەشاماتێکی زۆر دادەبەزین و بەرەو دوا دەبوونەوە ، کەگەیشتنە سەری ، کابرا گیانی سپاردبوو ، هەر لە جێگاکەی خۆیدا بە جێیان هێشت ، بەهەمان پاڵەپەستۆو تەنگە تاوەوە ڕێبوارەکان گەڕانەوە جێگاکانی خۆیان . شەمەندەفەرەکەش دووبارە کەوتەوە ڕێ . کابرای عەرەب کە ئەم ڕووداوەی بینی ، دەسەسرێکی گەورەی دەرهێناو بەدەم دەست سڕینەوە وەتی : «استغفر الله استغفر الله» کابرایەکی «ئەندونیسی» بە تەنشتیەوە ڕاوەستابوو ووتی «دیمەنی ناو ئەم شەمەندەفەرە شتێکی زۆر ئاساییە ، تۆ شەمەندەفەری جاکارتا ـ جلیونگ ببینی چی دەڵێی» . جارێکی کە شەمەندەفەرەکە لە مەحەتەیەکی بچووکی کە وەستایەوە . بلیت فرۆشەکە دابەزی ، بەم لاو ئەولادا چاوی دەگێرا ، کابرایەکی کورتەباڵا لەولاوە ڕاوەستابوو دەرکەوت چاوەڕێی ئەمی دەکرد . کە چاوی پێی کەوت بەدەنگێکی بەرز ووتی «ها کریم ، چیهەیە .... چی نییە ؟ ئیش و کار چۆنە ؟»

کریم سەری داخست و بە پێکەنینەوە وەلامی دایەوە :

«بەختمان یارە ... هەموویم فرۆشت .. بەلام تەنها ١٥٠ ڕوپیەم دەسگیربووە» .

«من پێم ووتی ١٥٠ ڕوپیەم دەوێ ... سێ دەرزەن ، دەرزەنی ٦٠ ڕوپیە دەکات ، با ١٠ ڕوپیەی تریشی فت بێ .. خۆ لەمە زیاتر ناتوانم قەولی هیچی کەت پێ بدەم» .

بلیت فرۆشەکە چووە پێشترەوەو چرپاندی بەگوێیا :

**«لەجاکارتا حەشیشەت ماوە ؟ .. هەندێکی لێ ببە لەوێ زۆر بەزەحمەت دەست دەکەوێ وا نیە ؟ .. لەمناوەشدا کڕیاری زۆرە .. بەلام گەنجەکانی جاکارتا هەمووی نەخۆشی دەستی ئەمەن ، لەبیرت نەچێ ئەمجارەیان پارەیەکی باشم دەوێ»**

کریم حەشیشەکەی خستە باخەڵەوەو سواری شەمەندەفەرەکە بووەوە .

لەو کاتەی شەمەندەفەرەکە کەوتە ڕێ ئافرەتێك هەروەك ئازاروژانی بێ حەشیشەیی و بەنگ پێچی پێ بدا ئاوا دەتلایەوەو هاواری دەکرد «وای برنجەکەم ئەو پۆلیسە برنجەکەی بردم» . بەگریان کەوتە دوای پۆلیسێکی جانتابەدەستەوە . پولیسەکە خۆی لێ ون کرد .. ئەمەندە گریا تاچاوی وەك جانتاکەی دەستی ووشك بوو .

لەکتێبی Hikayelerri gunumuz Dunya وەرگێڕاوە

نفیسینا : عماد بارزانی

# فرصەت

# «دەلیڤە» لە ژیانا مرۆڤدا

جارەکێ لە شەفێت زستانەکا زورا سارد من کتێبەکا حکایاتێت سەر بەهاتیا فەتخونیت و ئەز سەر نفیسینەکێ هەلبیوم و من زور یا پێ خۆشبو ڤیجا من بلشی زانی کو خویندمواریت ( مجلا کاروانا ) عەزیز ڤی حکایتێ فەخوینن .

خودانێ ویێ نفیسینێ تبێژیتن : ـ زۆر جاراو گەلەك وقتا فرصەتێت ( دەلیڤێت ) زۆرێت باش ویت چاك هەلدکەڤن و تێنە رێکا مرۆڤ ، ئەما هندەك جارا مرۆڤ پێ ناحەسیت و هندەك جاریش تێن مروڤ یێ نفستیە و یانیش یێ مەژغولە ئان شولەکادی وەناکەت مرۆڤ ویێ فرصەتی بخۆ بکار بینیت ، یانیش ئێك دیێ بیتە سبەب دیێ ئەو فرصەت ژ مرۆڤ چیتن ، ئەویێ دبێژیت : ـ فرصەت جارەکێ بو مرۆڤ تێت ، ڤیجا پێویستەو پێدڤیت مروڤ یێ هوشیار بیت و ژ دەستێ خو نەکەت هەکە پێ حەسیان چونکە ئەگەر چو بەلکی نەزڤریتەڤە ، ئان دیێ جارەکا دی هێتەڤە ، بەلێ لدیومایا رۆژێت مرۆڤ کو پێ چێ نبیت چ بکەت .

ڤیجا من بخو گوت : ـ مامەکە فرصەت هات بەلێ مرۆڤێ نەزانی بخو قازانجێ لێ بکەت ما صوچو خەتایت کێ نە .

تبێژن مرۆڤەك هەبیو خودانێ سێ دەلیڤا بووی : ـ ڤەتگێرن و تبێژن مرۆڤەك هەبیو یێ فەقیر حال و هەرچی شولا بەرێ خودایێ وەدەست دهاڤێتێ بەدەستێ ویڤە نە دەهات ، بەلکو دابیتە نەخوشیی و عاجزی لەسەر وی ، زورما دوی حالیدا هەر بخودا دوعایا ژ خودێ کەت کو حالێ فەقیریێ وبێ دەولەتی فورتار ببیت . رۆژەکی لە روژا هەر لە مالخودا نەچو دەریێ و پاشی گوت : ـ

خودیێ تو لهمیی جیێگایا یێ حازری ، چارەکێ لمن بکەی بو خاترا مەزناتیا خودا ئەز ژڤێ فەقیری بێمە دەریێ .

کەفتە دیێ وی کو بچیتە نکك ئێکی عاقلمەند کا چ رێکا بو ڤەنابینیت پاشی چەند رۆژەکا کاریێ چونا خوکر ، هەستا چار پێنج نانەك دگەل دوو سیێ سەرەکێت پێڤازا هاڤێتە ناڤ چانکا خودا ، ڤیجا پشت بخودیێ پشتاخودا ئاڤاییێ و بەرێ خودا وەغەرێ ، پاش چونەکا دویرو درێژ گەشتە ریلەکێ زور یپ‌دارو بار ودیت شێرەك ژێ هاتە دەریێ و قەستا وی مرۆڤ کر ، ئەو مروڤ گەلەك ترسیاو لەشێ وی هەموو ڤە تلەرزیا ژ ترسا ، وبخو گوت : ژبێ دەولەتیا من دویر نیە ئەڤ شێرە من بخۆت ، ئەڤە ببو طالعو نصیبیێ من ، ئەڤە بیو هاتیە رێکا من ، شێر پیچ پیچە هەر یێ نزیك تبیت لوی مروڤی ، مرۆڤەکەی بەرێ خودا شێری ئەما دیت کو چ رەنگ و نیشانێت شەرێ لنك شێر نینە تبێژن شێر بزمان هات وەگوتە وی مروڤی : ـ تو کێڤە تی دێ کێڤە چی ؟ مروڤەکەی گوتی : حالو مسئەلێت من ئەڤەنە ، حکایتا خو بو شێر ڤەگێرا میرکی گوتە شێری پا تە چیە : ـ شێری گوت : ـ ئەڤە زور لەمێژە کیانێ من یێ بوویە پەق و قالبێ من زور یت ئێشیت ڤیجا من پێ چێ نابیت چ بخوم و هەرو توف پێ ناوەستم بنڤم ، مروڤەکی گوتە شێری سەر چاڤا هەکە ئەز زڤریمەڤە دێ رێکا خو نکتە ئێنم و دێ علاجەکێ بوتە کەم . مروڤەکە چو سەر رێکا خو گەهشتە سەر کانیەکا ئاڤێ لبن دارەکێ رونیشت دا بێنا خو بەدەت دیت ماسیەکێ سەرێ خو ژ ئاڤێ ئینا

دەرێ بـەرێ خـودا مێـرکیو گـوتی دیێ کێڤـە چی ، مرۆڤەکەی حالو ئەحوالێت خو بو گوتن : ـماسی گوتی : ـ

هەکە تە ئێك دیت بو من ژی ببێژی ، مروڤەکەی گوتێ تە چیە : ـ ماسی گوتێ : ـ ئەڤە ما بەینەکە نافچـاڤێت من تێشنو ئەز هەر بێ کێژو من چ پێ نامێتە خارن ، مێرکی گوتێ هەکە ئەز ڤەکریام دێ رێکا خـو نـك تـە ئێخم . هەستاو کەفتەف رێکێ گەشتە جوتیارەکێو مـاندیبـون لێکر جوتیاری گوتی ئەڤە دێ کێڤە چی ؟ میرکی ژی بو گوت : ـ جوتیاری گوتێ برا ها دی بـو من ژی ببێژیێ ، میرکێ گوتی تە چیە : ـجوتیاری گوتێ : ئەڤە چەند سالە ئەز ڤێ زەڤی دەچینمو توڤی تاڤێمێ دەورانا زەڤی باش تێت بەلێ ما نەکا لینڤەکاوێ هەر یا روتیە وە هەر سال ئەز سێ گاسن تکەمو چ توڤ ژێ نامێت ، ڤیجـا تو دەولەت سەرێ خو پسیار ناکەی کا ئـەڤ زەڤیە بـوچی چ شین ناکەت ، کاڤا جوتیار بەحسێ دەولەتا سەری مێرکی کرد ، مێرکی بەردا کەنیو بخو گوت : ئەگەر دەولەتەك سەرێ مندا هەبا دا بوچی ئەز ئەڤ لاڤە بم . گوتە جـوتیاری باشە برا ئەگەر ئەز هاتمەڤە دێ رێکا خو تێرە ئێخم . چو گەشتە باژیرەکی لکولانەکێ دیت دوو حەرەسا چنگلێت وی گرتنو گوتە ئێکو دو ئەڤە ئێك .. وگوتە مروڤەکەی وەرە دگەل مە نك حاکمی .. مروڤەکی گوت من چ کریە ئەز تازە بێ گەیشتیە باژێرێ هنکو ، ئەزێ غەریبم بێ ئەشارەزا . گوناحا من چیە ، حەرەسا گوتی هەرە نك حاکمی پاشی لوێرێ ببێژە ئەزێ فقیرم بێ غەریبم ، مروڤەکە نەچاربو دگەل حەرەسا چوور گەشتە دیوانا حاکمی ، مروڤەکی دیت کو حاکم بێ لسەر کورسیەکا بلند رونیشتی ، سلام کر ، حاکمێ گوتێ : تو بێ مەملەکەتێ مە نی ، دێ کێڤە چیو تو لکیڤە دهێی ، مێرکی گوتێ : ـ قوربانو حاکمی خـوشبیت حالی من دگـەل بێ دەولەتیو خولی ســەرێ ئەڤەیە ، حاکم چ ئاخفتن نەکرن وێ گاڤێ وەگوتێ من چ بوتەپێ چێ نابیت ، مروڤەکە ژ باژێری دەرکەفت وکەشتە دەشتەکا رویتو دیت ریڤنکـەکێ ژوێڤە تێت نیـزیك بـو ســەلامەك کـرێ ئەوش کـوتێ ئـەڤـە دێ کێڤـە چی ؟ مروڤەکیش حـالێ خو بـو گوت . ریڤنکی گـوتێ : ـ خو زەحمەت نەدەو چ شەڤیا دیش بخو چێ نەکە ئەز دێ بوتە بێژم ... دێ سێ رێکێت چاكو باش بوتە بێژم وە دێ سێ فرصەت ( دەلیڤێت ) چاك بوتە هەلکەڤن هەکە تە بخـو بکار ئینان تو دێ لڤێ گرفتارێ دەرکەڤی نەما ئەگەر تە ژ دەستێ خو کرن دێ سەرێ تە تێدا چیت . مروڤـەکی گوتی کا ... خوزی ... دێ بلا هەلکەفتبا دابینی کا ئەز دا چ کـەم ... بیرا مـروڤەکی هـات گوتی : پـا نێ حـالو ئەحوالیت شێرەکیو جوتیارەکیو ماسیـەکێ ئەڤـەنە . ریڤنکی گوتێ : ـ بێژە جوتیاری خزینەکا دناف زڤیاوی‌دا هەی بلا بینتە دەرێ دێ عەردێ وی توڤ شینکەت ... وبێژە ماسی کیایەکێ هەیە لرەخ کونا وی دبن ئاڤێ‌ڤە بلا بخوت دێ چێ‌بیتەڤە ... وبێژە شێری بلا خو خوینا ئێکێ ژ هەمیا سیلەتر ( موستەحەق ) بکەڤزینیتو خو بدەتە بەر روژێ سێ جارا دێ چێ‌بیتەڤە . مروڤەکە زڤری وکەهشتە وەلاتێ جوتیار دیت کو جوتیاری بێنا خویا ڤەدای لدانکا زەڤیێ ئەویش بو گوت کو خەزینەکا دزەڤیاوی دا هەی جوتیاری غاردا زەڤیێو لێڤە کولی پارە ئینانە دەرێو گوتە مروڤەکەی وێ بخو بنیڤی کەین میرکێ گوتی : ـ ئەز چ پارا نابـەمو من چ نەڤـێنو خاتـرا خو ژێ خـاست چو گەهشتە ماسیو دەرمانێ ئێشاوی گوتێ : ماسی خۆ بن ئاف کر ( دوڕەك ) ئینا دەرێ وەهاڤێتە بەر مروڤەکەی ..... دو جارێت دی خو بن ئاف کر هەر جارەکێ ( دوڕەکا ) تازە تر ژیا پێش تر بو هاڤێتـە رەخێ کانی ، مـروڤەکی نەهەلگرتنو رێکا خو گرت چو گەشتـە شێری دیت کـو شێرێ خراپتر لێ هاتی زکێ وی بێ پشتێ ڤەنیوسیای ژبرسادا ، کاڤا مروڤەکە دیت هاتە نكو پرسیار ژی کر کا تە بو من چ کریە ... مێرکی گوتی : دەرمانێ‌تە یلبە دەرکا بیشێ‌تەوە مروڤەکەی گوتێ شیرو تو یپتنێ نەبووی بێ شوول هەین حالو ئەحوالێت ماسیەکێو جوتیارەکێ ئەڤە بوون ... شێری گوتی ... ئەڤە فرصەتێت ( دەلیڤێت ) هو یێت زور یێت باشو چاك بوتە هەلکەفتن بوچی بخو بکار نە دئینان دا فایدەی ژێ بینی دا ژ فەقیریێ خەلاس بی ...

پلوە دیارە کەسێ ژتە موستەحەق تر نیـە هەر خوینا تەیە دەرملنێ لەشێ من ... شێرێ مـە نەکـرە نەمەردی خو پێداداو لێکو پێك کر .

# بەرەی

هەقە بەرەیەكی نیشتمانین وەكوو لە نووسراوی ئایین‌و باوەڕ لەكوردستاندا بۆ یەكەم جار دەربارەی ئەم كۆمەڵــــە نیشتمان پەروەرە دواوم بەمەبەستی لێكۆڵینەوەی كۆمەڵایەتی وەك سەرەتایەك بۆ چوونە ناو باسێكی فراوانەوە لـــــــەم دەروازەیەوە ، بنەماكەی ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی 45 ــ 946 كە لەخوێندنگەی قەرەچەتانەوە بەفێركاری گوێـــزرامەوە بـۆ خوێندەنگەی ئەبابەیلێ لەهەڵەبجە، تووشی بەڕێز مامە رەزای سەرۆكی بەرەی هەقە بووم ، لەو سەردەمەدا گرنگی كۆمەڵەی مەهاباد ، دابووی لەم دیو ، بەوبۆنەیەوە دۆســـــــتایەتی‌و ئاشنایەتی‌یەك پەیدابوو .

ڕۆژگار هات‌و ڕۆیی لەمەهاباد ، شیخ حەمــــە ئەمین مەلحەم دی‌و ئەیزانی كە ئاشنای بەڕێز مامــەرەزام ، پێشەوا قازی موحەمەد دلوای ڕاپۆرتێكی لێكردم دەربارەی بــەرەی هەقە . بەرێدانی بەڕێز مامەرەزاو زانیاری حـــەمە ئەمین مەلحەم ڕاپۆرتەكە پێشكەش‌كراو كەوتە دەست خاوەرناسانی سوڤیەتی،دوای كەوتنی مەهاباد لانەوازی بردمی بۆ مەڵبەندی كرێچنەو هۆمەر ئەوغان‌و ماوەی ساڵێك مامەوەو ماوەیەكیش لەناوچەی ماوەت‌و سورداش‌و شلێر‌و ناوخوان‌و كەلكە سماق‌و شەدەلەو سەرگەلو‌و كە ناوچەی گرنگی ئەم بەرەیەن ، دوای گەڕانێكی تەواو بە خاوەری ناوەند‌و ئـــەمریكاو زۆربەی ئەوروپاو وە بەپێ هەموو كوردستان12ــ13 ساڵ دەربەدەری‌و 2 ساڵ بەندی‌و 6 ساڵ دەست بەسەری لەباشووری عێراق ، ئەوە هانی دام بۆ كۆكردنەوەی ئەم زانیاری‌یانەو بوونم لـــــە كۆمەڵی برایەتی كە شیخ مەحمودی نەمر ، ســــەرۆكی بوو ، بەشداریم لەو بزووتنەوەیەداو ناسیاوی لەتەك حمە ئاغـــای خوێیلەی كاكەیی ، وای‌كرد بایەخی پتر پێبدەم ، هەرچەندە نەبوونی كات‌و پارەتی‌و ڕێ‌نەدان ، هۆی كاڵی‌و كرچی ، ئەم جۆرە بەرهەمانەیە .

دوای بڵاوكردنەوەی نووسینەكانم لـــە 69ـ971دا ، مامۆستا مەحمود زامـــدار دەست‌نیشانی كـــردوە وەك سەرچاوەیەكی بێ‌ناز ، چاو پێ‌كەوتنم لەتەك بەڕێز پارێزەر كاك مستەفا عەسكەری . هەرچەندە كۆكراوەی كەشم هەبوو، نەك هەر لەسەر ئەم بەرەیە بەڵكو لەسەر بەرەكانی تریش وەكوو كاكەیی‌و ریبازە ئایینی‌یەكانی نەخشی‌و قادری ، هــەرچەندە ئەم كورتە لێكۆڵینەوانە نامان گەیەنێتە مەبەستو ئاكام ، بەڵام كەلێنێك پڕ ئەكەنەوە ، كاك شیخ حەسەن عەوالانی لەگۆڤاری رەنجی كریكاراندا ژمارە / 6 ساڵی 1980 لەبەرەی هەقـــە دواوە ، بێ ئەوەی پەنجە ڕاكێشێ بۆ نووسینەكانم لـــــەم ئاكارەدا ، وا بۆ جارێكی كەش لەرەوت‌و رەوی كـــاروانی ژیانماندا لەگۆڤاری كارواندا ، تەنینەوەو پەرە پێ‌داتێـــك دێتەوە گۆڕێ .

هەقە بزوتنەوەیەكی ئایینی ــ كۆمەڵایەتی‌یە لە ناوچەكا سورداش‌و میرزا رۆستەم‌و رانیەو پژدەرو ئاغجەلەرو ئەسكەر شواندا پەیدابوو ، دامەزرێنەری حاجی شیخ عەبدولكەر كوڕی حاجی شیخ مستەفا كوڕی حاجی شیخ رەزای ئەسكا بووە ، لە كەركوك كۆچی دوایی كردووە ، لەخانەقا نێژراو بەتەك شیخ قادرە سوورەوە.حاجی شیخ مستەفا لەجەنگ جیهانی یەكەمدا بەشداری بەرگری‌و بەرەنكاری ئینگلیـــز كردوە لە باشووری عیراقدا ، لە 1333 ك ــ 1915 ز كۆچ دوایی كردوە ، لە گۆڕستانی شیخ مارفی كەرخی نێژراوە لە دوایی‌دا گوێزراوەتەوە بۆ گۆڕستانی شیخ جونێـــد شیخ مەلا ئەحمەدی گەڵنیری لە 1919دا كۆچی كـــردووە ئەدمونس ، لە كوردو تورك‌و عەرەب ــ لاپەڕە 188 ، حـــاج شیخ عارف بە دامەزرێنەری هەقە دائەنێت ، بـــەڵام حاج شیخ عەبدولكەریم لە 1920 ی ز بەردی بنـــاغەی ڕێباز هەقەی داناوە ، تەنانەت ویستوویەتی فریوی بدات . حاج شیخ عەبدولكەریم لە ساڵی 1288 ی ك هاتۆتە جیهانـــەو دووجار چووە بۆ حەج لە 1340 ــ 1349ی ك دا . زانــــا تێگەیشتوو بووە زمانی عەرەبی‌و توركی‌و فارســــی زانیوە سەرەڕای زانیاری ئایینی ، لە شەدەلە لە بناری ئـەو دیو پیرەمەگرون لە 1361 كۆچی ، كۆچی دوایی كردووە .

وەكو لە نووسینەكانی پێشووم‌دا ڕوونم كردۆتەوە كـ ئەم بزوتنەوەیە لە ڕێبازی نەخشـــی وەرگیراوە بـــە گۆڕا كاری‌یەكی چاك‌و سەردەم ، بەڕێز مەولانا خالید لە زۆربە ناوچەكانی كوردستاندا بڵاوی كردۆتەوە۔ نووسینی مامۆستا زانا مەلا عەبدولكەریمی مودەریس ــ یادی مەردان .

وشەی هەقە ــ ڕاستی‌یە ــ لە كاتی یادوەری‌دا لــــ جۆش‌و جنبوشی‌و ئەندیشەی بیردا لەدەنگی ناكاوا لـــــ تەقەیەكدا ڕائەپەڕن‌و هاوار ئەكەن هەقە واتە خوداوەند هەقە ڕاستی‌یە ، ئەمە ئەندامانی ئەم ڕێبازگەیە لەكاتی بیر كردنەوە قووڵ‌و بێ هۆشی‌دا ، پێ‌ی هەڵدەستن .

ئەم بزوتنەوەیە گەشەو پەرەی سەندو لە ساڵی 1934 بەدەست بەسەری شیخ عەبدولكەریم برا بۆ كـــەركووك ژمارەیەكی لە ناسراوانی هەقە لە حەویجە دەست بەسەركرا لەوانە حاجی شیخ عارف‌و مامە رەزای برای حاجی شـــێ عەبدولكەریم‌و ، ژمارەیەكی زۆر لە لایەنگران بەرەو كەركوك بەرێ كەوتن جل‌و بەرگی خۆیان سووتاند‌و گونیەیان لەبەركرد لەژێر تین‌و تەوژمی جەماوەری لایەنگراندا میری ناچار بـــو شیخ بگێڕێتەوە بۆ شەدەڵە ، ئەو ساڵە بە ساڵی گونیە نا ئەبرێت .

ماوەیەك خامۆشی‌و كپی بەسەر ڕێبازەكەدا هات ، شێ

# هەقە

■ کەریم زەند ■

ەبدول‌کەریم کۆچی دوایی کرد راسپێری کردبوو کە رێبازگە حەرێت ، بەڵام زۆربەی سۆفی‌و پەیوەندەکان‌و لایەنگران مامە ەزایان هەڵبژارد بە سەرکردە ، شێخ عەبدول‌کەریم لە جەنگی کۆمەڵدا هاوبەشی‌و پاڵ پشتی لە شکری شێخ مەحمودی مری کردوە ، شاخی گەورە دێی پاراستوە ، لە سزای ەمەدا ئینگلیزەکان شەدەلەیان بومباران کرد ، گوندەکەیان ێ بەجێ هێشتن‌و رویان‌کردە ئەشکەوتی بۆلەترێ لەچیای ەمان .

دوای کۆچی شێخ عەبدول‌کەریم حەمە سووری جیا ووەوە ، ئەمانە بەرەیەکی تیژرەون لەم رێبازگەیە ، گوندی کلوقوت ناوچەیانە وەکو لێی دواوم ، بەڵام زۆربە لایەنگری مە رەزایان کرد .

مامە رەزا لە 1905دا هاتۆتە جیهانەوە ، پیاوێکی ێگەیشتوو روو خۆش ، کەم دوو ، زمانی عەرەبی‌و فارسی بوە ، شارەزایی لەوێژەو مێژوودا بووە ، هاو چەرخ‌و ێنی کەوتووخوالو بووە. دوور خراوەتەوە بۆ پارێزگای ەمارەو میسان لەسەر دۆستایەتی لەتەك ریکخراوە نیشتمانی‌یەکانی ئەو سەردەمەدا ، ژمارەیەکی لەلایەنگران رنووە بۆ بەرشداری بزوتنەوەی مەهاباد بە سەرۆکایەتی شێخ حەمە ئەمینی مەلحە کە خزمی سەید ئەحمەدی ەقایە .

مامە رەزا تەقەلایەکی زۆری داوە کە ئەم کۆمەڵە لە رێبازگەی ئاینی‌یەوە بەرەو بزوتنەوەی نیشتمانی بەرێت لە رساگەری‌یەوە بەرەو ئاسۆی کۆمەڵایەتی‌و نیشتمانی ەبەستی چەسپاندنی بەشداری‌و هاوبەشی‌و سەربەستی چینە چەوساوەکان‌و سەربەستی ئافرەت‌و بەهێزکردنی گیانی رایەتی‌و یەکێتی‌و نەمان‌و بنەبری جیاوازی‌و پەیرەوی ستوازی دیموکراسی‌و گەلەکاری‌و هەرەوەزی‌و پرس‌وڕای ووبرایەتی‌و بایەخ‌و بەهایە رەوشت‌و خووی پەسەندو رێك‌و ەرنەچوون لەریزی برایەتی‌و دوور کەوتنەوە لە سامان‌و چاو جنۆکی‌و فروفێڵ‌و رێزی سەوداو مامەڵەی راست‌و رەفتار ێ کردنی ، تەوقە لەتەك یەکتر کردن‌و دەست‌و قۆچ کردن ەگەڵ وشەی یا کەریم‌و یا رەزا . هەروەها رێك خستنی ێو باری کۆمەڵایەتی‌و دامەزراندنی خانەقاو تەکیە لە هەموو گوندێکداو گەڕان بەدوای راستی‌دا ، هەردوو کەس لە ایەنگران ئەگەڕان بە دیهاتەکانداو ئاموژگاری هەقەیان کۆ ئەکردەوە ناو ئەبران بەبرای گەڕۆك ، ئەوانەی کە لە یهاتەکاندا نیشتەجێ بوون بەبرای دڵسۆز ناو ئەبران .

زۆربەی لایەنگران چینی جوتیارو رەنج کێش‌و زەحمەت کێش بوون هەرچەندە تێگەیشتوویان هەبوو ، بەڵام خوێندەواریان کەم بوو ، میری دژایەتی ئەکردن ، بروایان بەیەکسانی هەبوو لە نێوانی ئافرەت‌و پیاودا لە نێوانی هەژارو دارادا ، هەموو کەسانی ناو کۆمەڵیان وەکوو یەك دائەنا ، ئەبێ دژی چەوسانەوەو خراپەو بەدکاری بن .

سەرۆکەکانی ئەم رێبازگەیە نوێژ کەرو ئایین پەروەرو پیشەوای ئاینی بوون ، لەلایەکی ترەوە هەموو هەقە باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەرو ( د ) قورئانی پیرۆز بووە ، خۆیان بەخوداناسی راستەقینە زانیوە ، مامە رەزا لە سەر نیشتمان پەروەری دووبارە لە 1944دا دوور خراوەتەوە لایەنگرانی هەموو سامان‌و دارایی خۆیانیان فرۆشت‌و شوێنی کەوتن‌و چوونە ئاغجەلەرو گۆك‌تەپەو بەرەو شوان‌و کەرکوك لە گوندی حاجی بەی‌خان کاکە رەزای کاکە ئەلی ئەسکەرو دوانزە کەس لە سەرکردەکانی هەقە بەندکران ، جەماوەری هەقە بەرەو ئاوایی یاروەلی نزیکی کەرکوك رۆیشتن ، میری ویستی تەفرەیان بدات ، ماوەیەك لەوێ مانەوە ، ئازوقەو خواردەمەنی‌یان کزبوو ، منداڵیان تووشی نەخۆشی بوون‌و مردن ، رەو دەستی پێ‌کردەوە، میری تەقەلای‌دا بیان ترسێنی بەڵام بێ سوود بوو ، میری ناچار بوو ئەوتە گفتوگۆ لە تەکیاندا چەند رۆژێکی خایاند ، لە ئەنجام‌دا گێڕاندنیانەوە بۆ ناوچەی شوان‌و چاوەڕێ بکەن بۆ ماوەی سێ رۆژ ، لەم ماوەیەدا میری مامە رەزا بگێڕێتەوە بۆ کەڵکە سماق بە مەرجێك کۆمەڵەکە بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان‌و لە ناوچەی مەرگە یا لە شار خانووبەرەیان بۆ بکات‌و خوێندنگەو بیمارستانیان بۆ دروست بکات ، بەندەکان بەر بدات‌و زیانیان ببژێریت ، هەندێکیان بەمە قایل بوون‌و هەندێکیان قایل نەبوون ، دووبەرەکی‌یان تێ‌خستن ، میری پەشیمان بووەوە ، بەڵام مامە رەزای نارد بۆ بیارەو هەڵەبجە کومەڵەکەش بەرووتی‌و برسێتی گەڕانەوە بۆ دێهاتەکانی ناوچەکانی جارانیان پاش ئەمە خامۆشی بەسەر داهات ، دوای چەند ساڵێك سەر لەنوێ هەڵی‌دایەوە بەرێك خستنی رێزی خۆیان ، مامە رەزا گەڕایەوە بۆ ئاوایی کەڵکە سماق لە 30–6–1953 لە کاتی نوێژی بەیانی‌دا لەسەر بەرماڵ تووشی نەخۆشی گێڕی بوو لە 25–2–1964دا کۆچی دوایی کرد رەوانی پاکی بەخاك سپارد .

ئێستا بەڕێز کاکە حەمەی کوڕی شوێنەواریەتی لە گوندی کەڵکە سماق لەو بەری دووکانەوە .

ئەمە تەواوکەری لێکۆڵینەوەکانی ترم نی‌یە بەڵکو رۆشنایی خستنەسەرە نیاز وایە لە چاپ کردنەوەی نووسراوی ئایین‌و باوەڕ لە کوردستاندا فراوانی تری بە دوادا بێت نەك هەر دەربارەی هەقە ، بەڵکو دەربارەی باسە کۆمەڵایەتی‌یەکانی تریش ، هەڵهاتنی ئەستێرەی کاروانم بە هەڵزانی‌و دەرفەتێکی بۆ رەخسانم لەم بوارەدا .

ئەندازیار : جەلال مەحمەت خۆشناو

# خلیسکانی ئۆتۆمۆبێل

## لەسەر ڕێگاوبان .. هۆی .. و .. چارەسەرکردنی

ئاشکرایە ڕۆژێ هەزاران کەس دەبنە قوربانی کارەساتی ڕێگاوبان و بە جۆرێکی سامناك ئەو کارەساتانە لە زۆربووندان کە ڕادەیان گەلێك لە کارەساتەکانی فڕۆکەو شەمەندەفەر زیاترەو سەراپای ڕووی زەوی گرتووتەبەر ، هەر چەندە وەکو ئەمان باسی ناکرێت .

بێگومان کارەساتی ڕێگاوبان پەیوەندییەکی دوو قۆڵی توندی هەیە لەگەڵ خێرا لێخوڕین و کەم تەرخەمی و ناکاری ئاژیارەکان (Drivers) ، ئەمەشیان ئەوە ناگەیەنێ کە ئۆتۆمۆبێل و ڕێگا هیچ دەورێك نابەخشن لە ڕوودانی ئەم کارەساتانە .... بەڵکوو پتەوی ئۆتۆمۆبێل و چاك دروستکردنی ڕێگا هۆی گرنگن بۆ کەم و زیاد کردنەوەی ئەنجامی ئەم کارەساتانە کە بەشی زۆری خلیسکانە لەسەر ڕێگاوبان .

ئەوەی لەم چەند دێڕەی خوارەوە دەربارەی خلیسکان (Slippage) و هۆیەکانی و چارەسەرکردنیان دەست نیشانی دەکەم ، چەند ڕوون کردنەوەیەك و ئامۆژگارییەکی سەر پێیین ئاراستەی هاونیشتمانیانی دەکەم بۆ زانین و سوودوەرگرتن .... ئەگینا لێکۆڵینەوەو پشکنینەوەی بابەتێکی وەك ئەم باسە پێویستی بە چەندەها دراساتی ئەکادیمی ی دوورو درێژ هەیە کە ئەمەشیان ئاراستەی ڕووی پسپۆڕو زاناکانە بۆ لێدوان و چارەسەرکردنی بەجۆرێکی ئەندازیاری . بۆ ئێمەمانان کە لە دوورو نزیك کارەساتەکانی خلیسکان پەیوەندیمان لەگەڵدا دەبەستێ پێویستە چەند لایەکی ئەم بابەتە بزانین و خۆمان لە مەترسییەکان دوور بخەینەوە ، بەتایبەتی زۆربەی زۆرمان لە هاتووچۆی سەر ڕێگاوبانەکانین چ ژیانی خۆمان خستبێتە دەست ئاژیارێك یاخود خۆمان ئاژیاری ئۆتۆمۆبێلەکان بین .

بۆ زیاتر چوونە ناو باس پێویستە زانستێکی سەرەتایی تایبەتییەکانی ڕێگاوبان و بنەڕەتی پێکهاتنی بزانین ، جگە لە جۆرەکانی بۆ ئەوەی خەملاندنی جوولانەوەمان لەگەڵ بنیاتنانی ئەم جۆرانەو پێکهاتنەکانی یەك بگرن و کەمترین مەترسی بخرێتە ڕووی ئەو کۆستانەی لە چاوەڕوانمانن .

### جۆرەکانی ڕێگاوبان

١ - ڕێگای خۆڵین .
٢ - ڕێگای چەوڕێژ (تێکەڵە) یاخود بەرد ڕێژ .
٣ - ڕێگای قیرتاوی کۆن .
٤ - ڕێگای ئۆتۆبان و قیرتاوی تازە (Asphaltic — Concrete)

سێ جۆری یەکەم خلیسکانێکی ئەوتۆی لەسەر ڕوونادات تەنیا لەکاتی بەفرو باران و تەڕو تووشی



نەبێت ، بە هۆی ئەوەی کە ڕوویەری ئەم جۆرە ڕێگایانە درو بە پەناو پێچو هەورازو نشێویان زۆرن کە دەبنە هۆی لێك خشاندنێکی زۆر لەبەینی لاستیکی تایەو ڕووی ڕێگاکان . بەلام ڕێگای قیرتاوی تازە نموونەی ژیاری (حضارە) ئەمرۆمانە لە سەراپای ڕووی زەوی‌و بە جۆرێك ئەوا بلاو دەبێتەوە بە پێی پێویستی خورتی‌و خێرایی لەم چەرخەو زیادبوونی هۆی هاتووچۆ بە ئەندازەیەکی بێ ئەژمار .

نیشتمانمان لەو مەیدانەدا هەنگاوی بالای ڕاناوە بۆ دروستکردنی ڕێگای قیرتاوی تازە کە بە جۆرێك سەراپای عیراقی گرتووتەبەرو لەبەر ڕێكوپێکی دروستکردنی ئەم جۆرە ڕێگایانە کە ڕاست‌و لووس‌و پان‌و کەم کەوەو پێچن ، ماوەی هاژوانێکی خێرادێتە کایە ... بۆیە خلیسکان لەسەر ئەم جۆرە ڕێگایانە پەیدا دەبێت‌و ئەنجامیش کارەساتی لەناو چوونی چەند گیانێکە هەرساتێ جگە لەزیانی تریش .

خلیسکان ئەنجامی ڕێگاو لاستیکی تایەیە ، بەلام چۆنی‌یەتی ڕێگا دروستکردن‌و ئەو چینانەی لێی پێكهاتووە ، پەیوەندی‌یەکی دینامیکی توندی‌یان لەگەل یەك هەیە ، بۆیە باشترە بزانین بنیاتنانی ڕێگا چۆنەو لە چ پێكهاتووە :ـ

## ڕێگاوبان لە چ پێك هاتووە ؟

هەر ڕێگایەك کە دروست دەکرێت بریتی‌یە لە چاككردنی خۆڵی زەوی‌و دانانی چەند چینێکی تێکەڵەو بەرد ڕێژ ، ئەوسا قیرکردنێکی هونەری . واتە :ـ

١ ـ چینی خۆڵ (Earth Work)

٢ ـ شۆستە :

أ ـ چینی ژێر بنچینە (Sub Base) کە چەوڕێژە

ب ـ چینی بنچینە (Base) کەچەو یا بەردڕێژە

٣ ـ قیرتاو :

أ ـ چینی ژێرەوە (Binder Course) بۆ بەستنی قیرو بەرد .

ب ـ چینی لەڕوو (Wearing Course) .

ئەم چینانەی ژێر قیرتاو (Sub Grade) بۆ ئەوەیە کە قیرتاوەکە بەڕێك و دروستی دابنیشێ ، بۆیە بایەخدان بەو چینانەو ڕێك دروستکردنیان دەبنە هۆی گرنگ بۆ کەم کردنەوەی ڕوو چوون‌و کەندو کۆسپەی ڕووی ڕێگا ، چەندە خاکی عێراق بە تێکرایی خاکێکی کشتوکالی‌یەو خۆڵی کشتوکالیش بۆ ڕێگا دروست کردن زۆر لاوازە ، بۆیە دەبینین زۆربەی زۆری ڕێگاکانمان پاش دروشتکردنیان بە ماوەیەك دەکەونە ڕووچوون و کەندو کۆسپەیان لەسەردا پەیدا دەبێت ... لەبەر هەندێ پێویستە گرنگی زۆر بدرێتە کوتانەوەی چینە خۆڵەکانی ڕێگا لە ئاستی دروستکردن‌و مشت‌ومالکردنی بە جۆرێکی ڕێك‌و پێك .

خۆ ئەگەر بتواندرێ وەها دروست بکرێت کە هیچ جۆرە جوولانەوەیەکی نەکەوێتە ناو لەکاتی هاتوچۆکردن بەسەریا ، چونکە هەر ناڵەباری‌یەك بەسەر ئەم چینە خۆڵانە دابێت ئەوا کارتێکردنی دەگەڕێتەوە سەر گشت ئەو چینانەی لەسەری داندراون .

چینەکانی شۆستە کە بریتین لە چەوڕێژو بەردڕێژ ئەستووری‌یان دەگەڕێتەوە سەر قورسایی‌و زۆری هاتووچۆ ، بۆیە پوختە دروستکردنیان بە پێی ئەو کارتێکردنانەی بەسەریا دەڕوات گرنگە بۆ هێنانەدی چینێکی توندو پتەو کە قیرتاوەکەی بە ڕێکی لەسەر دابنیشێ . ئەگینا دەبنە هۆی ڕووچوون‌و بەرزو نزمی ڕووی قیرتاوەکەو پەیدابوونی خلیسکان .

خلیسکان لەبەینی ڕووی قیرتاوو لاستیکی تایە دەست پێدەکات‌و هۆی گرنگی خلیسکانیش لێكخشاندنە ، چونکە چەند لێكخشاندن لەبەینی تایەو قیردا زۆربێت ، ئەوا خلیسکان کەم

دەبێتەوە ، بە پێچەوانەی ئەمەش چەندە لێکخشاندن کەمبێتەوە ئەوا خلیسکان زۆر دەبێت . لێرەدا ئەو هۆیانەی لێکخشاندن کەمو زۆر دەکەن دەستنیشان دەکەم :ـ

**١ - لاستیکی تایە :**

رووبەرێکی کەم لەلاستیکی تایەکان پاڵە پەستۆ دەخاتە رووی قیرتاوو ئەم پارچە رووبەرانەی تایە هەموو قورسایی ئۆتۆمۆبێلەکان دەخەنە سەر رێگا ، بۆیە لێکخشاندنێکی کەمیان لە نێوان‌دا پەیدا دەبێت و ئەنجامیشی خلیسکانە ، هەر بۆیە ئەو کۆمپانیانەی تایە دروست‌دەکەن بەجۆرێك پانی تایە لێکدەدەنەوە بۆ ئەوەی زۆرترین لێکخشاندن پەیدابکات ، جگە لەوەی نەقشی راست و چەپیشی تێ‌دەخەن بۆ هەمان مەبەست . هەوای ناو تایە دەورێکی زۆر دەبینێ بۆ کەم کردنەوەو زیادکردنی ئەو رووبەرەی بەرێگاوە نووساوە ، چونکە هەرچەندە هەوای ناو تایە زیاد بێت ئەوا رووبەرەکەی کەم دەبێتەوەو لێکخشاندیش کەم دەبێتەوەو دەبێتە هۆی خلیسکان ، بۆیە پێویستە هەردەم هەوای ناو تایە لەرادەی راستی‌خۆی بێت ، جگە لەوەش چەند ماوەی بەکار هێنان بەسەر تایەدا رەت بێت ، ئەوا نەقشەکانی دەرۆن و لووس دەبن ، بۆیە لەو کاتەدا تایە گۆڕین داوایە .

**٢ - قیر (Bitumen)**

لە هۆیە گرنگەکانی خلیسکان قیری رێگایە بە تایبەتی
لە رێگا قیرتاوە تازەکان‌دا ، چونکە رادەی قیرلە تێکەڵاوی قیری (Asphalt Mixture) لەبەینی ٤ ـ ٦٪ . خۆئەگەر بێتو رادەی قیرەکە ٤ ٪ بێت یا کەمتر ئەوا رووی رێگاکە درِ دەردەچێت و وەکو کارتیخ تایەکان دەسوێت و ئەمەش زیانێکی ئابووری نیشتمانی‌یە ، بەلام ئەگەر رادەی قیرەکە لە ٦ ٪ زیاتربێت ئەوا قیرە زیادەکە دەکەوێتە سەر رووی رێگاو پاتێکی (Lager) چەورو لاستیکی پەیدا دەکات (Bleeding) و دەبێتە هۆی خلیسکانێکی سامناك . بۆیە پێویستە لەکاتی دروست‌کردنی رێگا ، ئەندازیارەکان زاڵبن بەسەر گرتنەوەی تێکەڵاوی قیر لە کارگەی قیر (Asphalt Plant) و بەپێی هاوکێشەی خۆی کە بۆی داندراوە ، ئەگینا چارەسەرکردنی پاش دروست‌کردن گرانەو گرانیش رادەوەستێ . هەندێك جار بەمەکینەی گرێدەر (Grader) ئەو پاتە زیادەیە لە رووی رێگا هەڵدەگرن یاخود وردە چەوی بەسەردا رۆ دەکەن و دەیکوتنەوە . بەلام چارەی راستەوخۆی ئەم نالەباری‌یە ئەوەیە کە هەموو قیرتاوەکە هەڵبگیرێت و سەر لەنوێ دروست‌بکرێتەوە .

ئامۆژگاریم بۆ ئاژیارەکان ئەوەیە کە رەنگی قیرتاوی رێك و تەواو وەك رەنگی خۆڵەمێشە ، هەر کاتێ رەنگی قیری رێگا رەش هەڵگەرابێت ئەوا قیرەکەی لە رادەی خۆی زیاترەو جێی مەترسی خلیسکانە ... بۆیە پێویستە یەکسەر خێرایی‌یان کەم کەنەوەو ئەملاو ئەولا بەستێرن نەکەن و هیچ برێکیش نەگرن ، بە تایبەتی ئەگەر تۆزو خۆڵیش لەسەر جادەکە نیشتبێ و بارانیش بباریٰ ئەگینا وەکو خلخلۆك بە دەوری خۆیاندا دەسورێنەوەو خۆیان لە ئۆتۆمۆبێلێکی تر دەدەن ، یا چاڵێك پەردەکەنەوە ، یا شاخێك دەسمن . !

**٣ - ئاوو تەڕو تووشی :ـ**

دوشمنی هەروگەورەی رێگاوبان ئاوە . چ بۆتێکدانی یاخود بۆمەترسی





خلیسکان ، چونکە ئەو ئاوەی دەکەوێتە سەر رووی قیرتاوی رێگا ، پاتێکی تەنك پەیدا دەکات لە بەینی تایەو قیرتاوی رێگاو لەیەکیان جودا دەکاتەوە بە جۆرێك زۆر جار فورسایی ئۆتۆمۆبێلەکان نابنە هۆی لابردنی ئەم پاتە تەنکە ، واتە لەم ماوەیەیدا لێك خشاندن لەبەینی لاستیکی تایەو رووی قیرتاوی رێگا نامێنێ‌و خلیسکان دەست پێ‌دەکات ، هەر بۆیەش پێویستە ئاوەڕۆی رێگاکان رێك‌و پوخت‌بن بۆ ئەوەی ماوەی هیچ جۆرە ئاو راوەستانێك نەمێنێ بەسەریا .

ئامۆژگاری‌یە بۆ ئاژیارەکان لەم کاتانەدا خێرایی خۆیان سووك بکەنەوەو برێك نەگرن‌و ستێرن بەم‌لاو ئەولادا نەشکێننەوەو بەگێری قورس رێ بکەن‌و بەمەترسی لێ‌نەخورن ، ئەگینا لەهەر چرکەیەك خلیسکان دەست‌پێ دەکات ، خۆ ئەگەر تەپایی سەر رێگا چینێکی بەفربێت ئەوا بەتەواوی تایەو رێگا لەیەك‌جودا بوونەتەوەو مەترسی‌یە کەش زیاترە . هەروەها لەکاتی تەزرە باران‌دا هۆی خلیسکان لە بەفریش زیاتر دەبێت بەهۆی ئەم بۆشاییانەی دەنکە تەزرەکان لەبەینی خۆیان پەیدای دەکەن‌و رووبەری لێك خشاندن کەم دەکەنەوە ....

**٤ ـ چەوو بەردی شکاوی ناو تێکەلاوی قیر :ـ**

ئەو کەرەستانەی تێکەلاوی قیری لێ‌پێك‌هاتووە پەیوەندی یە کی زۆری هەیە لەگەل خلیسکان ، هەر بۆیەش لەم تێکەلاوە بەتایبەتی لەچینی لەروو رادەی بەردی شکاو دەبێ لە ٩٠ ٪ کەمتر نەبێت بۆ ئەوەی دژی‌یەك بکەوێتە رووی قیرتاوەکە ، لەسەرەتای دروست‌کردنی رێگا ئەوەندە هەست بە بوونی ئەو چەوو بەردە ناکرێت ، بەلام بە تێپەر بوونی رۆژگار لە ئەنجامی لێك‌خشاندن لەبەینی تایەو رێگادا ئەو چەوو بەردەی لەرووە رووبەرێکی موزاییکی پەیدا دەکات ، خۆ ئەگەر ئەو بەردە شکاوەی ناو تێکەلاوە قیری‌یەکە چەشنی نەرمە بەردبێت ، ئەوا ئەو رووە مۆزاییکی‌یە زۆر لووس دەبێت‌و دەبێت بەهۆی زۆر سووان‌و مەترسیی خلیسکانی بەسەردا کەمترنی‌یە لەمەترسیی ئەو پاتە قیرە تەنکەی کە دەکەوێتە سەر رووی رێگاوبان . خۆ ئەگەر رووی رێگا دڕ بێت ئەوا لەکاتی هاتووچۆدا ئاژیار خۆی هەست بە دڕی رێگاکە دەکات چ لەگرتنی ستێرن یاخود لەو دەنگەی کە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی لێك‌خشاندن . ئەگەر رێگاکەش لووس بێت ئەوا دەنگە کەو هەست‌پێ‌کردنی چەشنی لێ خورینی سەر رێگای تەپو شێ‌دار خۆی دەخەملێنێ .... بۆ خۆ دوورخستن لە خلیسکانی سەر ئەم جۆرە رێگایانە هەمان ئامۆژگاری ئاراستەی ئاژیارەکانە ...

**٥ ـ کەلێك وورده شتی کەهەن دەبنە هۆی خلیسکان‌و پەیوەندی‌یان لەگەل هۆیە گرنگەکاندا هەن ، بۆ چاودێری کردن ئەوا لێرەدا دەست‌نیشانیان دەکەم :ـ**

ا ـ خێرا لێ‌خورین لەسەر رێگای بەکەندو کۆسپە .

ب ـ خێرا لێ‌خورین لەسەر رێگای بەکەوەو پێچ .

ج ـ خێرا لێ‌خورین لەسەر رێگای لێژ .

د ـ برێکی راستەوخۆ گرتن .

هـ ـ راستەوخۆ شکاندنەوەی ستێرن لە لوفەکاندا .

و ـ چاو دێری‌نەکردنی یاساکانی هاتووچو (قوانین المرور) .

ز ـ خێرا لێ‌خورین لە لوفەی ناڕێك کە بە شێوەیەکی ئەندازەیی دروست‌نەکراون چونکە کەوانەی لوفە دەبێ دوورو درێژبێت‌و گۆشەی لوفەش نابێت لە ٣٠° کەمتربێت ، جگە لەوەی دەبێ لوفە لێژایی بە پانی بۆ ژوورەوەی هەبێ (Super Elevation) تاکو ماوەی فرێدانی ئۆتۆمۆبێل بۆ دەرەوەی رێگا کەم‌کاتەوە .

ئەمە بوو خلیسکان‌و هۆیەکانی وە ئەنجامی کەم‌کردنەوەو خۆ بە دوور خستنیش لە کارەسات بەدەست ئاژیارەکانە ، کە بەمەترسیی لێ‌نەخورن بە پێی چەشنی رێگاوبان‌و کەم‌و کورتی‌یەکانی تێ‌ی کەوتووە .... وە زۆر راستە کە ووتوویانە لێ‌خورین :ـ هونەرە ، ئامە ، ئاکارە .!

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە ئینگلیزی یەوە
عومەر عەبدوڵڵا کۆیی

# نووسەرێکی ئینگلیز لە تاهیر بەگی جاف دەدوێ

نووسەری ئینگلیزی (ئێدمۆندز) (Edmonds) دەربارەی شاعیری گەورەی کورد (تاهیر بەگی جاف) ی نووسیوەو دەڵێ :-(١)

تاهیر بەگ کوڕی وەسمان پاشای کوڕی محەمەد پاشای جافەو لە ساڵی ( ١٢٩٥ ك = ١٨٧٨ز ) هاتۆتە . دنیاوەو لە ساڵی ( ١٣٣٧ ك = ١٩١٨ ز ) دا لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەیان بردوتەوە هەڵەبجەو لە گوندی ( عەبابەیلێ ) ناشتراوە .

تاهیر بەگ لە هیچ قوتابخانەیێکی بەرزی نەخوێندووە ، بەڵکو تەنیا لە قوتابخانەی گوندەکەی خۆیانی خوێندووەو بەمە زانیاری یەکی گشتی وەرگرتووەو بووە بە شاعیرێکی گەورەو بەناوبانگ ، ووشەی شیعرەکانی جوان و ناسك و پڕ سۆز بوون و شاعیر نەك هەر بە کوردی بەڵکو بە چوار زمانان شیعری داناوە : بە کوردی و فارسی و تورکی و عارەبی و هەموو شیعرەکانی سەرواداروکێش سوارو ئاوازە داربوون .

شاعیر لە ژیانی ڕۆژانەشی تابلێی زیرەك و بەتوانابووە . بۆ نموونە : جارێکیان لە سەردەمی حکومەتی تورکی عوسمانلی ، پازدە ساڵ پێش شەری گەورە ، مێجەر سۆن ( Major Soane ) بە گەشتێکی نهێنی هاتۆتە کوردستانی عیراق و پاش ئەوەی چەند ساڵێك لەوێ ماوەتەوە ، چووەتە ماڵی وەسمان پاشای باوکی شاعیرو بۆ ماوەی شەش حەوت مانگ بووە بە خزمەتکاریان و ناوی لە خۆی ناوە (غولام حوسێن) .

ئەو غولام حوسێنە زۆر بە چاکی ئیشی لە لایاندا کردووەو تاهیر بەگیش زۆر بەرێزەوە سەیری کردووەو لەبەر غەریبی و بێکەسی خۆشی ویستووەو بەچاوی خزمەتکار تەماشای نەکردووە . لە ئەنجامدا کە دەبینێ خووڕەوشتی وەکو خووڕەوشتی خزمەتکاران نی یە گومانی لێدەکا کە پیاوێکی ئاسایی بێ . ڕۆژێك تاهیر بەگ تەماشای کتێبێکی فەرەنسی دەکات ، غولام حوسێن (مێجەر سۆن) کە چاوی پێ دەکەوێ ، پێی دەڵێ : «گەورەم ئایا تۆ فەرەنسی دەزانی ؟» تاهیربەگیش لە وەڵامدا دەڵێ : «بەڵێ کەمێکی لێ دەزانم . ئایا تۆ هیچی لێ دەزانی ؟» . غولام حوسێن دەڵێ : «بەڵێ شەش حەوت ساڵان لەمەوبەر لە وولاتی فارس (ئێران) خزمەتکاری فەرەنسی یەك بووم و کەمێ زمانی فەرەنسی لەو فێربووم .»

کە تاهیر بەگ ئەمەی لێ بیست ، هەموو . جارێ بە زمانی فەرەنسی لە بارەی هەندێ مەسەلەی نهێنی یەوە لەگەڵی دەدوا . ڕۆژێ لە کاتی قسەکردنی لە گەڵ غولام حوسێندا گوێی لێدەبێ غولام ووشەی (نۆ = No) لە جیاتی ووشە (نا)ی کوردی بەکاردێنێ ، لەوەوە گومانی پتر لێ دەکات و بۆی ساغ دەبێتەوە ناوی ڕاستی (غولام حوسێن) نی یەو ئینگلیزە . لەپاشدا شاعیری زیرەك بانگی دەکات و دەڵێ : «ناوت چی یە ؟»

غولام حوسێن گوتی : «بەقوربانتبم ، مەبەستت چی یە ؟ ناوم ئەوڵێە کە تۆ بانگم پێ دەکەی .»

تاهیر بەگ دەڵێ : «نەخێر تۆ ناوی خۆت گۆڕیوە ... تۆ ئینگلیزی !!»

غولام حوسێن گوتی : «چۆن دەزانی ؟» تاهیربەگ دەڵێ : «لە قسەکانت را دیارە !»

ئینجا غولام دەڵێ : «ڕاستە من ئینگلیزم و ناوم مێجەر سۆنە ، بۆ ماوەی چەند ساڵێك گەشتم بەناو ئێران و تورکیاو عیراقدا کردووە .»

کە تاهیر بەگ ئەمەی زانی ، داوای لە (مێجەر سۆن) کرد کە لەوێ نەمێنێتەوە نەوەك لەگەڵ حکومەت لێیان ببێ بە ناخۆشی (واتە : حکومەتی عوسمانلی) . ئینجا (سۆن) لێیدا ڕۆیشت و لەدواییدا گەشتنامەیێکی نووسی و تێیدا گەلێ باسی زیرەکی و وریایی تاهیر بەگی کردووە .

سەرچاوە

---

(١) بڕوانە کتێبی :-

KURDS, TURKS AND ARABS )

Edmonds, Oxford University Press, 1957, Pages : 149, 150, 151 .

# بوومەلەرزە

امیرة اسماعیل

بوومە لەرزە بریتی‌یە لە لەرینەوەیەکی ( اهتزاز ) خێراو بەردەوام لە ماوەیەکی جیاجیاو ( بڕاو ) دا تووشی توێکڵی زەمین دەبێ لە ئەنجامی جوولانەوەکانی زەمین ( الحرکات الارضیة ) دا . ئەو جوولانەوەو چالاکی‌یانەی زەمینیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستی‌یەی کە زەمین بە تەنێك دائەنێ کە لە باری گرژبوونێکی بەردەوامدایە بۆیە بەردی چینەکانی زەمین لە باری جوولانەوەیەکی زۆر لەسەر خۆو بەردەوامدان بەرەو زەمین واتە بۆ چەقی زەمین .

لە تاقی‌کردنەوە یەکدابینرا کەوا بەردەکانی ناو قوولایی دەریاو دەریاووشەکان بە خێرایی‌یەکی زۆر بەرەو چەقی زەمین دەجوولێنەوە کە گەورەترە لەو خێرایی‌یەی کە بەردەکانی کیشوەرەکان دەجوولێنەوە لە ئەنجامی ئەم جیاوازی‌یە لەو جوولانەوەیە دا چەند تێکچوون ( اضطرابات ) و لەرینەوەیەکی هەمەجۆر روودەدا ، ئەم لەرینەوانەش توند یان کز دەبن بە جۆرێك کە ئادەمیزاد هەستی پێناکات بەلام لەلایەن ئامێرێکی پوانگە ( رصد ) ەوە تۆمار دەکرێ .

لەو هۆیانەی کە کاریگەرێکی کەم دەکەنە رووداني بوومەلەرزە گڕکانەکانە ( فۆلکێنەکان ) ە کە تەقینەوە و هەڵچوونی ئاگر پژێنەکان دەبێتە هۆی لەرینەوەیەك لە ناوچەی دەوروپشتی گڕکانەکان . بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە گشت چالاکی‌یەکانی گڕکانەکان دەبێتە هۆی رووداني بوومە لەرزە .

هۆی دووەم‌و گرنگترینیان ئەو لێك جیابوونەوەیە یە کە لە توێکڵی زەمین روودەدا لەو شوێنانەدا کە بەرەنگاری پاڵەپەستۆیەکی زۆرو گرژ بوون دەبن ، بەم جۆرە ئەم لێك‌جیابوونەوەیەی توێکڵی زەمینە دەبێتە هۆی بەرەڵلابوونی ووزە لەسەر شێوەی شەپۆلی هەمەچەشنەو بوومەلەرزەی لێ پێك دێ .

هەر وەکو پێشتر ووترا بوومەلەرزە توند یان کز دەبێ ، پێوەرێك هەیە بۆ پێوانی توندی بوومەلەرزە دابەش کراوە بۆ (10 ) پلە ، بوومەلەرزەی پلەی یەکەم ئادەمیزاد هەستی پێ‌ناکات‌و هەروەها هیچ کارێکیش ناکاتە سەر ئەو تەنانەی کە لەسەر زەمین‌دا هەن .

کاریگەری بوومەلەرزە دەست پێ‌دەکا لە پلەکان تا دەگاتە پلەی هەشتەم کاتێك کە خانوبەرەکان دەرزیان تیا ئەکەوێ ، بەلام لە پلەی دەیەم کە بەرزترین پلەیە دەبێتە هۆی رووخان .

بۆ ئەوەی زیاتر لە بوومەلەرزە بگەین ئامێرێکی (رصد) هەیە کە پێی دەووترێ ( Geomograph ) لە ئەنجامی رووداني ئەو لەرینەوانە هێلێکی خواروخێچ دەکێشرێ کە بە تۆماری بوومەلەرزە ( سجل الهزات الارضیة ) ناو دەبرێ .

ئەم هێڵەش لە سێ بەش پێك دێ . بەشی یەکەمی ئەم شەپۆلانە بریتی‌یە لە درێژە شەپۆلەکان کە هێمای پیتی ( P ) ی بۆ دادەنرێ‌و لە خێراترین شەپۆلەکانە کە ئامێری ( رصد ) تۆماری دەکات . بەشی دووەم بریتی‌یە لە شەپۆلە لاوەکی‌یەکان کە هێمای پیتی ( S ) ی بۆ دادەنرێ ئەمەش لە پانە شەپۆلەکانە لە لەرینەوەی دەنگەکانی بەردەکان پەیدا دەبێ بە ئاراستەی بلاوبوونی شەپۆلی یەکەم ( درێژە شەپۆلەکان ) وەخێرایی‌یەکەش کەمترە لە خێرایی درێژە شەپۆلەکان .

بەشی سێ‌یەمی شەپۆلەکان پانە شەپۆلەکانە کە بەهێمای ( L ) دیاری دەکرێ . خێرایی ئەم شەپۆلەش لە خێرایی هەموو شەپۆلەکان کەمترە .

لە گۆڤاری ( الجیولوجی ) یەوە
ژمارە( 4 ) آذاری 1988 ... وەرگێردراوە

نووسینی : فرانك پارکەر

غازی فاتح وەیس
لە ئینگلیزیەوە وەرگێڕاوە .

# بەیەکدا چوونی درکاندنی ڤاوڵ و کۆنسۆنانتی وەستاو

(The Coarticulation of Vowels and Stop Consonants)

کورتەی باسەکە :

ئەگەرچی (± گڕی) [±Voice] هاوکێشەیەکی فۆنۆلۆژیی زۆر گرنگە بۆ جیاکردنەوەی فۆنیمی ب ، د ، ج ، پ ، ت ، ك لەبەشە ڕوون و ئاشکەراکەی زمانی ئینگلیزیدا (فۆنۆلۆژی - وەرگێڕ) . بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم هاوکێشەیە بەو ڕادەیە گرنگ بێ لە بەشی فۆنەتیکدا . واتە ئەم هاوکێشەیە ناتوانێ دەورو پشتی ئەو ڕاستیە بداتەوە کە هەندێ فۆنیمی گڕ لە کاتی درکاندنیاندا تالەباریکەکانی قوڕگیان لەگەلدا ناجولێنەوە . بەم جۆرە وادەرئەکەوێ کە قورسێتی هەوا[1] لەکاتی درکاندنی فۆنیمەکەدا گرنگترین نیشارەتی هەستپێکراوە بۆ جیاکردنەوەی فۆنیمی گڕی وەستاو و فۆنیمی کپی وەستاوی دوای ڤاولی هێزدار . بەلام لەهەمان کاتدا بەکارهێنانی ئەم نیشارەتە بۆ جیاکردنەوەی فۆنیمەکانی پاش ڤاوڵ هێشتا زۆر ڕوون نەبۆتەوە . هەروەها درێژبوونی ڤاوڵەکەی پێش فۆنیمە وەستاوەکان کە بەگرنگترین نیشارەتی هەستپێکراو ئەژمێردرێ بۆ ئەم مەبەستە ، هێشتا بۆ ئەوە ناشێ دەورو پشتی سیستەمێکی سێ جۆرە درێژبوونی ڤاول بەرپەرچ بداتەوە لە زمانی ئینگلیزیدا . وا دەرئەکەوێ ئەم نیشارەتە هەستپێکراوە کەلێك چوونێکی هەیە لەگەل هاوکێشەی [± گڕی]ی فۆنۆلۆژیدا بۆ دەرخستنی نرخی گڕێتی دەنگە وەستاوەکانی پاش ڤاوڵ ، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەل چۆنیەتی کۆتایی پێ هاتنی ڤاوڵەکەی پێش دەنگە وەستاوەکە . واتە کۆتایی پێهاتنێکی لەسەرخۆو درێژی ڤاوڵێك ئەوە ئەگەیەنێ ئەو فۆنیمەی کە دوا بەدوای دێت ئەبێتە دەنگێکی گڕی وەستاو و کۆتایی پێهاتنێکی کوتوپڕی یەکسەری ڤاوڵێك ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو فۆنیمەی دوا بەدوای ڤاوڵەکە دێت ئەبێتە دەنگێکی کپی وەستاو . ئەم شێوە شی کردنەوەیە تەنگو چەلەمەی لەرینەوەی تالەباریکەکانی قوڕگ لەکاتی دروستبوونی دەنگێکی وەستاوداو درێژبوونی ڤاولی پێش دەنگی گڕ بنبڕ ئەکات .

## لێکۆڵینەوە .

یەکێك لە تەنگو چەلەمەکانی فۆنۆلۆژیی زمانی ئینگلیزی کە مشتو مڕی لەسەرکراوە ، نرخ و گرنگێتیی گڕی (ئاوازەدارێتی - وەرگێڕ) فۆنیمە وەستاوەکانە . لە سنووری فۆنۆلۆژیدا ، فۆنیمە وەستاوەکان ئەبن بە دوو بەشەوە [ + گڕی] وەکو ب ، د ، گ وە [ − گڕی] وەکو پ ، ت ، ك واتە جیاوازی گرنگی نێوان ئەم دوو ڕیزە فۆنیمە لە مەزرای فۆنۆلۆژیدا بەشێوەیەکی گشتی بوون و نەبوونی گڕیە . لەم مەزرایەدا ئەم جۆرە جیاکردنەوەیە زۆر گرنگ و سوودبەخشە ، چونکە هەموو فۆنیمە گیرەکانی

(Obstruent) زمانی ئینگلیزی یەك ئەخاو ئەیانخاتە قالبێکەوە . واتە هەموو فۆنیمە گیرەکانی [ + گڕی] ، فۆنیمەکانی [ - گڕی] ئەبن بە هاوتایان بەپێی هەمان شوێن و چۆنیەتی دروست بوون و دەربڕینیان . ئەم جۆرە جیاکردنەوەیە ئەبێتە ئاوێنە بۆ یەکالا کردنەوەیەکی گشتی زانیاریی بیستەرو قسەکەر لە ڕووی زانستیی زمانەوە (linguistic Competence) واتە زانیاری زمان[٢] .

ئەگەر چی لەوەیە [± گڕی] هاوکێشەیەکی چاك و بەنرخ بێ لە مەزرای فۆنۆلۆژیدا ، بەلام مەرج نییە هەمان دەور بگێڕێ لە مەزرای فو نەتیکدا (Phonetics) . بەم جۆرە هەندێ لە پشکێنەران گومانیان لە بوونی گڕێتی (ئاوازەدارێتی) دەنگدارێتی وەرگێڕ) وەکو نیشارەتێکی گرنگ بۆ جیاکرنەوەی فۆنیمە وەستاوەکان کردووە[٣] . هەروەها هەندێکی تریان ئەڵێن جیاوازیی هەست پێکراوی گرنگ لەنێوان ب ، د ، گ ، و پ ، ت ، ك ، لەپێشی وشەدا قورسێتی هەوایە ، وەیا دەست پێکردنی جوولانەوەی تاڵەباریکەکانی قوڕگە . تا ئیستاش هەندێ کەس ڕایان وایە کە جیاوازیی نێوان ئەم دوو گرووپە فۆنیمە کاتێ ئەکەونە دوای ڤاوڵەوە ، بە پێی درێژبوونی ڤاوڵەکەی پێشیانەوە دەستنیشان ئەکرێت .

لەوەیە ئەم ڕایە بەهۆی ئەوەوە سەری هەڵدابێ کە [± گڕی] بە هاوکێشەیەکی (مجرد)ی فۆنۆلۆژی دابنرێ و لە سنووری فۆنەتیکدا بە شێوەیەکی زۆر تەواو روون نەکرێتەوەو نەچەسپێنرێ . هەروەها ئەو ڕێنەکەوتنەی دەربارەی جیاوازی هەست پێکراوی گرنگ لەنێوان (گڕی)و (کپی)دا لە ئینگلیزیدا وەیە بگەرێتەوە بۆ ئەو باوەڕەی کە ئایا ئەو فۆنیمە وەستاوانە لەدوای وشەوە دێن وەیا لەناوەڕاستیەوە وەیا لە کۆتایی وشەکەوە !! بۆ نموونە هیچ هۆیەکی بنەڕەتی نیە بۆ باوەڕکردن بەوەی کە جیاوازی هەست پێکراو لە نێوان ئەو دوو فۆنیمەی کە لەسەرەتای وشەی «Bob» و «pop» دێت وەکو جیاوازی نێوان ئەو دوو فۆنیمە بێ کە لە کۆتایی ئەو دوو وشەیەوە دێن . لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵ ئەوە ئەدەم کە لەرینەوەی تاڵەباریکەکانی قوڕگ لەکاتی درکاندنی فۆنیمی وەستاوداو درێژبوونی ڤاوڵەکەی پێش ئەو فۆنیمانە نیشارەتێکی گرنگی تەواو نین بۆ جیاکردنەوەیەکی هەست پێ کراو لە نێوان فۆنیمە وەستاوەکانی زمانی ئینگلیزی ، بەبێ گوێدان بە شوێنی دروست بوونیان .

بۆ ئەوەی خاسیەتەکانی فۆنیمە وەستاوەکان وپەیوەندییان بەو ڤاوڵانەی کە لەپێشیانەوە دێن شی بکەینەوە ، پێویستە دەستنیشانی ئەم تێرمە بکەین : گڕی و قورسێتی هەوا لەناو دەمدا . وا بزانم باشتر ئەوەیە لەسەر دەستنیشان کردنەکەی «لادیفوگد» (Ladefoged) بڕۆین کە ئەڵێ : «گڕی و کپی ئەگەڕێتەو بۆ ئەو حاڵەتە تایبەتیەی تاڵەباریکەکانی قوڕگ لەکاتی درکاندنی دەنگدا» بەپێی ئەم پێناسینەی «لادیفوگد» ئەگەر بە دەنگێك وترا [گڕ] لە سنووری فۆنەتیکدا ئەوا ئەبێ تاڵەباریکەکانی قوڕگ بجوولێنەوە لەکاتی کردنەوەی قوڕگدا بۆ درکاندنی ئەو دەنگە . هەروەها (لادیفوگد) لەبارەی قورسێتی هەواوە ئەڵێ «قورس بوون و قورس نەبوونی دەنگ ئەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی تاڵەباریکەکانی قوڕگ و کردنەوەی کوت و پڕو هاتنەوەیەکی ئەندامێکی دروست کەری دەنگ» . بەم جۆرە ئەگەر تاڵەباریکەکانی قوڕگ لەحاڵەتی کپی دابوو (واتە کراوەبێ) لەکاتی ، وەیا یەکسەر دوای بەرەڵلاکردنی فۆنیمێکی وەستاو ، ئەوا ئەو فۆنیمە ئەبێتە فۆنیمێکی قورس لەڕووی بەرەڵلاکردنی هەواوە .

ئەگەر چی ت بە شێوەیەکی گشتی دەنگێکی کپەو د دەنگێکی گڕە لەزمانی ئینگلیزیدا ، بەلام لەدەربڕینێکی ئاسایی و بەجێی یەکەم دەنگی وەستاو لە وشەی «dime»دا (پارەیەکی زۆر کەم - وەرگێڕ) تاڵەباریکەکانی قوڕگ دەست ئەکا بەلەرینەوە دوای کردنەوەی قوڕگ (واتە کردنەوەی قوڕگ بۆ دروست کردنی ڤاوڵەکە ، نەك بۆ دەنگی [د] - وەرگێڕ) . بەم جۆرە فۆنیمی د بەلای کەمەوە لەهەندێ حاڵەتدا بەئاشکەرا «کپە» بەپێی ناساندنەکەی «لادیفوگد» . لەلایەکی ترەوە لەکاتی دەربڕینی ت لەسەرەتای وشەدا ، تاڵەباریکەکانی قوڕگ لە حاڵەتی کپیدایە بەپێچەوانەی فۆنیمی د ەوە . واتە ت ی سەرەتای وشە هەمیشە لەگەڵ هەوایەکی قورسدا دەرئەبردرێ و د ی سەرەتای وشە هەمیشە بەسووکی و بەبێ ئەو هەوایە دەرئەبردرێ . بەم جۆرە وادەرئەکەوێ کە جیاوازی هەست پێکراوی گرنگی نێوان پ ، ت ، ك و ب ، د ، گ ی سەرەتای وشە لەزمانی ئیگلیزیدا هەرگیز گڕێتی (ئاوازەدارێتی) نییە بەڵکو قورسێتیی هەوایە .

ئەو یاسانەی کە دەربارەی فۆنیمە وەستاوەکانی

سەرەتای وشـەوەکراوە لەلایـەن (Halle و Radley و Hughes) پشتگیری ئەم رایە ئەکەن و ئەڵێن :

// ئەگەر چی لەزۆر نموونەدا گڕی و کپی فۆنیمی ب ، د ، گ و پ ، ت ، ك جیائەکەنەوە ، بەڵام لە ئینگلیزیدا گڕیی دەنگ دەورێکی ئەوتۆ نابینێ لەم جیاکردنەوەیەدا ، جیاوازیی گرنگ لەنێوان ئەم دوو ریزە فۆنیمەدا لەوەدایە کە ریزی یەکەم لەکاتی دەربڕینیاندا هێزێکی زۆرتر دروست ئەکرێ لەپاش ئەو جێگەیەی کە ئەو دەنگانەی تێدا دروست ئەبێ و بێ گومان ئەم هێـزەش ئەبێتـە هۆی قـورس بوونی پ ، ت ، ك و ئـەبێتـە ئیشارەتێکی هەست پێکراوی گرنگ بۆ دەست نیشـانکردنی نرخی گڕیی دەنگە وەستاوەکان(۱) .

بـەڵام جیاوازیی نێـوان پ ، ت ، ك و ب ، د ، گ ی سەرەتای وشە ئەوەندەی ئەو جیاوازییە ئاڵۆز نیە کاتێ ئەکەونە دوای ڤاوڵەوە . فۆنیمە وەستاوەکانی پاش ڤاوڵ وا دەرئەکەوێ بەستراون بە ڤاوڵەکانی پێشیانەوە بەشێوەیەکی ئاڵۆزو هێشتا بـەشێوەیـەکی تەواو روون نـەکـراوەتـە وە . (Hammarberg Daniloff) ۱۹۷۳ بـەم شێوەی خـوارەوە تەنـگ و چـەڵەمـەی پێوەندی نێوان فۆنیمە وستاوەکان و ڤاوڵ شی ئەکەنەوە :

// ڤاوڵ بە تەبیعەتی حاڵ درێژ ئەکرێتەوە کاتێ ئەکەوێتە پێش حاڵ کونسنانتێکی گڕەوە ، بە پێچەوانەی ئەو ڤـاوڵانەوە کاتێ ئەکەونە پێش کۆنسنانتی کپەوە . لەوەیە ئەو درێژبوونەی ڤاوڵە هۆی گڕبوونی کونسنانتەکە بێ ، بەڵام لەوە ناچێ ئێستا هۆیەکی میکانیکی بەجێ هـەبێ و حیساب بـۆ ئەم دیـاردەیە بکات ، لەلایەکی ترەوە ناش توانین ئیشارەتێکی بەجێ دابنێین بۆ ئەوەی بڵێین گڕی لە کۆنسنانتەکەوە تەشەنەی کردووە و کاری کردوەتە سەر ڤاوڵەکە ...

بەم جۆرە دۆزینەوەی پێوەندی نێوان درێژبوونی ڤاوڵ و گڕبوونی کونسنانتی دوای ڤاوڵەکە ، ئامانجێکی سەرەکی ئەم وتارەیە . بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە بپشکنین حەز ئەکەم یەکەم گوێ بدەم بە گرنگیی درێژی ڤاوڵ بـۆ دەست نیشان کـردنی فۆنیمەکانی پاش ڤاوڵەکە .

«رافائیل» (Raphael) دیـراسـەیـەکی دەربارەی فـۆنیمە وەستاوەکانی کۆتایی وشە لە زمانی ئینگلیزیدا کـردووە و ئەڵێ «کپی» و «گڕی» ئیشارەتێکی گرنگ نیە بۆ دەست نیشان کردنی ئەو جیاوازییە ، چونکە لەرینەوەی تاڵەباریکەکانی قورگ لەکاتی دروست بوونی فۆنیمە وەستاوەکەدا گرنگ نیە بۆ دەست نیشان کردنی ئەو خاسیەتەی کە پێی ئەوترێ «گڕی» .

لەباتی لەرینەوەی تاڵەباریکـەکانی قـورگ ، «رافائیـل» باوەری بەوەیە کە ئیشارەتی گرنـگ بۆ دەست نیشـانکردنی دەنگی وەستاوی کۆتایی وشە ، درێژی ڤاوڵەکەی پێشیەتی ، بەپێی رای «رافائیل» کە ئەڵێ // هەموو کونسنانتێکی کۆتایی وشـەو گڕی ـ دەنـگ بە کپ لەقـەڵەم ئەدرێ کـاتێ مـاوەی دەربڕینی ڤاوڵەکەی پێشیان کورت بێ و بەگڕ ئەدرێنـە قەڵەم ئـەگەر مـاوەی دەربڕینی ڤـاوڵەکەی پێشیـان درێـژبێ . لە ئـەنجامـدا «رافائیـل» ئەڵێ «مـاوەی دەربـڕینی ڤـاوڵی پێش کـۆنسنانتـەکە ئیشـارەتێکی تـەواوە بـۆ هـەست پێکـردنی خـاسیەتی (گـڕی) دەنگی وەستاوی کـۆتایی وشـەو دەنگی خشۆك و گڕی ـ دەنگ» . ئەگـەر چی ئەم رایـەی «رافائیـل» لەسەر ئەساسی دەلیلێکی ئاشکەرای دەنگە ، بەڵام لە هەڵەو ناتەواوی بەدەرنیەو لە دواییدا ئەگـەرێمەوە بـۆ باسکـردنی نارێکی رایەکەی «رافائیل» .

رایەکی تر کە گرنگیی «گڕی» لە دەنگە وەستاوەکاندا وەکو ئیشارەتێك بەهەڵە ئەخاتەوە ، ئەنجامی ئەو دیراساتەیە کە دەربارەی ئـاخاوتنی «چپە» کراوە . بـۆ نموونـە (کاتـز) (Schatz) دیراسەیەکی دەربارەی درێژیی ڤاوڵ لە ئاخاوتنی چپەدا کردووەو ئەڵێ : ئەو ڤاوڵانەی کە پێش کۆنسنانتە گڕەکان ئەکەوون مـوعەدەلی گشتیـان درێژتـرە بە (۱۳/۳) خـول لە چرکەیەکدا لە قسـەکردنی ئـاساییـداو بە (۰ر۱۵) خـول لە چرکەیەکدا لە قسەکردنی چپەدا لەوانەی کە پێش دەنگی بوونە زیادەیەی ڤاوڵی پێش دەنگی گڕی وەستاو لە قسەکردنی چپەدا ئـەوە دەرئەخـا کە قسـەکەری ئینگلیـز ئاگـادارە لەوەی کە درێژیی ڤاوڵ ئیشارەتێکە لە زمانی ئینگلیزیدا . هەروەها ئەم ئەنجامە ئەوە ئەگەیـەنێ کە درێـژیی ڤاوڵ ئیشـارەتێکی بە هێزترە لە «گڕی» .

سەرەرای ئەم بەڵگەیە کە لەسەر ئەساسی تاقیکر نەوە وەدەست هێنراوە ، موناقەشەیەکی تیۆریی ئـاشکەرا هـەیە دژی گڕیی دەنگ . بەپێی ناسـاندن ، گـڕی دەرناکـەوێ لەکاتی قسەکردنی چپەدا . لە لایەکی ترەوە درێژیی ڤاوڵ و (قورسێتی هەوا) ، بەلای کەمەوە لەرووی تیۆرییەوە ، چپە

کرین کاری تێ ناکات . بەم جۆرە گومان لەگڕی ئەکات وەکو نیشارەتێکی گرنگ بۆ جیاکردنەوەی دەنگە وەستاوەکان چونکە ئاسانی ئەتوانین بڵێین : لە پێشدا ئەتوانین دەست نیشانی دەنگە وەستاوە گڕەکان بکەین لەئاخاوتنی چپەدا . بەڵام ئەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەوەی گرنگە لە حاڵەتێکدا لەوەیە ئەوەندەی ئەوە گرنگ نەبێ لە حاڵەتێکی ئاخاوتنی تردا . واتە وێنەی شیکردنەوە کە بەکار ئەهێنرێ بۆ شیکردنەوەی ئاخاوتنی چپە ئەوەیە جودایێ لەگەڵ ئەو وێنانەی کە بەکار ئەهێنرێ لە ئاخاوتنی ئاساییدا .

ئەگەر چی لەوەیە درێژی ڤاوڵ نیشارەتێکی هەست پێکراوی تەواوترو چەسپێنراوتر بێ لە نیشارەتی «گڕێتی»وە تیۆری درێژی ڤاوڵ کە لەلایەن (رافائیل‌و کاتز)ەوە پێشنیار کراوە لەوەیە خاسیەتێکی پچڕ پچڕ بێ‌و ئەدرێتە پاڵ کارتێکردنێکی گرنگی ترەوە بۆ نموونە قسەکەرێکی زمانەکە وا فێر بووە هەر چی ڤاولێك دوای کۆنسنانتی گڕهات درێژی بکاتەوە . ئەم درێژکردنەوەیە بەشێکە لەو زانیارییەی کە قسەکەرەکە دەربارەی زمانەکە هەیەتی‌و بە تەواوەتی ئاگای نیە . بەم جۆرە ئەگەر قسەکەرەکە هەستی بە درێژی ڤاولەکەی پێش کۆنسنانتەکەکرد ئەوا لە دواییدا ئەتوانێ هەست بەوە بکات کە ئەو کۆنسنانتەی کە دوای ڤاولەکە دێت ئەبێتە کۆنسنانتێکی گڕ ، وە بەپێچەوانەوە هەست بەوە بکات کە کونسنانتەکە ئەبێتە کۆنسنانتێکی کپ .

لە لایەکی ترەوە تەنگو چەڵەمەی ئەساسی درێژبوونی ڤاوڵ ئەوەیە کە ڤاولی درێژ ئەبێ وەکو تێرمێکی نسبی سەیر بکرێت ، ئەگەر وانەبێ چۆن ئەتوانین حیساب بۆ تێکەبشتنی ئاخاوتنێکی خێرا وەیا لەسەر خۆ بکەین ؟ . ئەم تێرمە ئەبێتە تێرمێکی بەجێ ئەگەر بڵێین لێرەدا دابەش بوونێکی ئەساسی هەیە لە درێژبوونی ڤاولدا بۆ هەر قسەکەرێك . واتە ڤاولی درێژی نیسبی بەرانبەر بە ڤاولی کورتی نیسبی دابنێین . کاتێ فۆنیمێکی وەستاو لەپاش ڤاولێکی درێژی نیسبی‌یەوە دێت ، ئەوا ئەو فۆنیمە وا لێك‌ئەدرێتەوە کە دەنگێکی گڕەو ئەگەر فۆنیمێك لەپاش ڤاولێکی کورتی نیسبی‌یەوە هات ئەوا وا هەستی پێ‌ئەکرێ کە فۆنیمێکی کپە . بەڵام ئەم تیۆرە بەشێوەیەکی گشتی ناتوانێ حیساب بۆ سیستەمی درێژی‌ی ڤاولی سێ پلە بکات (ئەم سێ پلەی درێژییە مەرج نیە فۆنیم بن) .

بۆ نموونە سەیری ئەم ئاوخاوتنەی خوارەوە بکە کە تەنیا دوو فۆنیمەکەی پێشەوەم وەرگێڕاوەتە سەر شێوەی فۆنەتیکی :

Pot ( Pa ...... )

Pod ( Pa. ..... )

"Pawould" Pad ( Pa: ..... )

بەپێی تیۆری ڤاوڵ درێژی ، بیستەرێك کەتەنیا گوێی لە (Pa.) و (Pa:) بووبێ ئەوا یەکەم بە (Pot) = (مەنجەل - وەرگێڕ) لە قەڵەم ئەداو دووەم بە (Pod) = (ڕان - وەرگێڕ) وەیا بە (Pad) = (Pa = کورتکراوەی وشەی (Papa)یە واتە باوك - وەرگێڕ) وەیا یەکەم بە (Pot) یان بە (Pod)و ئەوەی سێیەم بە (Pad) (ئەگەر درێژی ڤاوڵ بەنیسبی لەقەڵەم بدرێ) . ئەنجامی ئەم تیۆرە ڕوون‌و ئاشکەرایە ، ئەویش ئەوەیە کە ناتوانێ حیساب بۆ زیاتر لە دوو پلەی درێژی بکات بۆ ڤاوڵ .

ئەوە ئاشکەرایە کە (رافائیل‌و کاتز)

بە شێوەیەکی تەواو مەسەلەکە یەکالا ناکەنەوە بۆ ئەوەی گومان لە درێژی‌ی ڤاولدا نەمێنێ وەکو نیشارەتێکی گرنگ لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ دەست نیشان کردنی نرخی گڕی فۆنیمی پاش ڤاوڵ . گریمان لەبەر خاتری موناقەشەکردن ئەوەی وتران ڕاستن ، بەڵام چۆنیەتی پەیوەندی‌ی نێوان دەنگە وەستاوە گڕەکانی کۆتایی وشەو درێژ کردنی ڤاولەکەی پێشیان تا ئێستا لە ئاشکەرابوونەوە دوورە . ئایا گڕی‌ی دەنگی وەستاوی کۆتایی وشە ئەبێتە هۆی درێژکردنی ڤاولەی پێشی وەیا ئایا ڤاولەکە بەهەندێ شێوە کار ئەکاتە سەر هەست پێکردنی دەنگە وەستاوەکەی دوای ! . بەشێوەیەکی گشتی رای یەکەم پەسەندکراوە ، بەڵام تا ئێستا بە بەڵگەوە ئیسپات نەکراوە . هەروەها وا دەرئەکەوێ کە ئەگەر چی حاڵەتی گڕی لە هەست پێکردنی دەنگی وەستاودا جێگەی پرسیارەو گومانی لێ ئەکرێ‌و هەروەها درێژی ڤاولیش ، حەللێکی تەواوی گومان لێکراو نیە . ئەوەی پێی ئەوترێ حەللی تەواو ئەبێ دەست نیشانی پەیوەندی سەبەبی (هۆی) نێوان درێژکردنی ڤاوڵ‌و گڕی‌ی دەنگە وەستاوەکان بکات .

تا ئەم ڕادەیە هەوڵم‌دا بۆ ڕوونکردنەوەو ئیسپاتکردنی ئەوەی کە گڕی لە نێوان دەنگە وەستاوەکان‌و درێژی‌ی ئەو ڤاولەی کە لەپێشی ئەو دەنگە وەستاوانەوە دێت ، نیشارەتێکی

هەست پێکراوی گرنگی تەوا نییە بە پێی ئەو ڕایەی کە لەسەرەوە باسکرا . ئەگەر ئەم ڕایە تەواوبێ ، ئەوا گڕی و درێژی ی ڤاول هەر یەکەیان ئەبن بە نیشارەتێکی سەر بەخۆی سانەوی ، یا هەردووکیان ئەنجامی تێهەڵکێشان و بەیەکداچوونی درکاندنن (Coarticulation) واتە ئەنجامی کارتێکردنی سیگمێنتی (Segment) ئاخاوتنە بەسەر یەکێکی تردا (دانی لۆڤ و هەمەر بیرگ ١٩٧٢ لاپەڕە ٢٣٩) .

بەلام بەلای منەوە ئەوەی پێی ئەوترێ گڕی و درێژی ڤاوڵ وەکو دوو نیشارەتی سانەوی ، مەسەلەکە ئەخاتە قالبی جەدەلەوە . گریمان ئەم دوو نیشارەتە تەنیا لەبەر ئەوەی هەز ڕێگایەکە بۆ گوێ نەدان بە قبووڵ کردنی ئەوەی کە نازانین هۆی دروست بوونیان چییە ـ لەبەر خاتری موناقەشەکردن بەڕای من هەردووکیان ئەنجامی تێهەڵکێشان و بەیەکداچوونی درکاندنی دەنگن .

ئەگەر بەیەکداچوونی درکاندن لەنێوان ڤاوڵی درێژ و کۆنسنانتی وەستاوی گڕدا هەبێ ، ئەبێ کام سیگمێنت هەڵگری نیشارەتی هەست پێکردن بێ ، ڤاوڵەکە یا کۆنسنانتەکە ؟ .

لە دیراسەکەیدا ، (ڕافائیل) خاڵێکی گرنگ دەستنیشان ئەکات کە نابێ پشت گوێ بخرێ ، ئەویش ئەوەیە کە درێژکردنەوەی ڤاوڵ لەپێش هەموو کۆنسنانتێکی گڕداو فۆنیمی وەستاوی خشۆک و گڕێ ـ دەنگە گیرەکاندا ڕووئەدا . بەم جۆرە ، درێژکردنەوەی ڤاوڵ بەتەنیا نابێتە خاسیەتی دەنگە وەستاوەکان ، چونکە تەنیا سیمای کۆنسنانتەکانی دوای ڤاوڵی درێژ گڕییە و هۆکەشی بەیەکداچوونی درکاندنە لەڤاوڵەکە خۆیدا ڕوونەداوەیا ئەنجامی گڕییە بەشێوەیەکی گشتی . بەلام ئەگەر یەکێك لەم دوو دیاردەیە دەست نیشانکرا بۆ ئەوەی ببێ بە دیارخەری ئەوی تر ، ئەوا بێ گومان بەشێك لەمەسەلەکە حەل ئەبێ .

وەکو لەسەرەتادا وترا کە لە هەندێ حاڵەتدا لەکاتی دەربڕینی هەندی دەنگی وەستاوی گڕدا هیچ جۆرە لەرینەوەیەکی تاڵەباریکەکانی قوڕگی لەگەڵدا دەرناکەوێ و لەهەندێ حاڵەتی تردا تۆزێك گڕی وەیا لەرینەوەی ئەو تاڵانە دەرئەکەوێ . بۆ نموونە بەپێی ڕای «لادیفۆگد» دەنگی [ب ، د ، گ ]ی ئینگلیزی لەسەرەتای وشەوەئەتوانرێ بووترێ تۆزێك گڕن . بەلام زۆر گرنگە سەرنجی ئەوە بدەین کە لە هەندێ حاڵەتی تردا [ب]ی سەرەتای وشە دەنگێکی کپەو بەدرێژایی دەربڕینی ، تاڵەباریکەکانی قوڕگ نالەرینەوەو [ب]ی کۆتایی وشە بەهیچ جۆرێك دەربڕینی بەرەڵلا ناکرێ وە [ب]ی سەرەتای وشە تۆزە تۆزە ئاوازە پەیدا ئەکات لە چەپەوە بۆ ڕاست و [ب]ی کۆتایی وشە تۆزە تۆزە کپ ئەبێ لە چەپەوە بۆ ڕاست[٥] . بەم جۆرە لە زنجیرەیەکدا وەکو (bvb) = (Vowel)) (v)ئاوازە لەکاتی داخستنی سەرەتادا دەست پێ ئەکا یا لەکاتی بەرەڵلاکردنیداو کۆتایی پێ ئەهێنرێ لەکاتی داخستنی کۆتاییدا .

ئەگەر ئەم دیاردەیە بخەینە پێش چاومان ، ئەوا ئەتوانین بلێن ئاوازە لەدەنگە وەستاوەکاندا وەکو درێژە پێدانێکی ڤاوڵ بەهەر دوو لادا حیسابی بۆ ئەکرێ . لەوەیە درکاندنی ڤاوڵەکە پێش بکەوێ و بچێتە سەر دەنگە وەستاوەکەی سەرەتای وشەکە تا وەکو دەنگە وەستاوەکەی کۆتایی بڕوات . ئەم ڕایە دوور نییە پەسەند بکرێ ئەگەر هاتوو سەیری پشتی زمان و ناوەڕاستی زمان و سەری زمان بکەین وەکو سێ ئەندامی دروستکەری جوداو نیمچە سەر بەخۆ ، ئەگەر چی بەشێك لەزمان بەشداری ئەکا لە دەربڕینی کۆنسنانتداو ئەو بەشەکانی تری زمان سەربەستە تا ڕادەیەك بۆ پێش خستنی شوێنی دروست کردنی ڤاوڵە داهاتووەکە . گرنگترین نموونە لەم ڕووەوە دەنگی وەستاوی لێوییە کە زمان لەکاتی دەربڕینیاندا بەگشتی و بەتەواوەتی سەر بەستە لە جوڵانەوەدا لەکاتی دەربڕینی ڤاوڵەکەی سەرەتا یا کۆتاییدا .

بەلام هەروا بە ئاسانی بڵێین کەوا ئاوازە لە کۆنسنانتدا ئەنجامی پێشکەوتنی ڤاوڵە نزیکەکەیە ، بەڵگەیەکی تەواو نییە . چونکە ئەم ڕایە حیساب بۆ ئەوە ناکات کە هێشتا ئاگامان لە جیاوازییەکی سیستماتیکی هەیە لەنێوان پ ، ت ، ک و ب ، د ، گ دا . پێش ئەوەی لەم مەسەلەیە بکۆڵینەوە ، هەوڵی پیشاندانی هەندێ بەڵگە ئەدەم بۆ باوەڕکردن بەوەی کە ئاوازە لەکۆنسنانتە وەستاوەکاندا ئەنجامی بەیەکداچوونی درکاندنە[٦] .

بەیەکداچوونی درکاندن لەنێوان ڤاوڵ و فۆنیمی وەستاوی دوای ڤاوڵ لەوەیە ئەنجامی دابەش بوونێکی ژێرەوە بێت لەنێوان دەنگە گیرەکان و ڤاوڵدا . لەرینەوەی

تاڵەباریکەکانی قوڕگ وا دیارە خاسییەتێکی هەمیشەیی ڤاوڵە ، بەڵگەش بۆ ئەم هەڵوێستە لەو ڕاستییەدایە کە هەندێ زمان تەنیا ڤاوڵی دەنگداری تێدایە (بۆ نموونە ئینگلیزی) . بەڵام هیچ زمانێك نییە تەنیا ڤاوڵی بێدەنگی هەبێ . لە لایەکی ترەوە ، نەجووڵانەوەی تاڵەباریکەکانی قوڕگ وا دەرئەکەوێ خاسیەتێکی هەمیشەیی دەنگە کۆنسنانتە گیرەکانی بێ و ئەمەش ئەنجامی ئەو ڕاستیەیە کەهەندێ زمان تەنیا کۆنسنانتی کپی وەستاوی هەیە (بۆ نموونە زمانی کۆری) . بەڵام نەبووە زمانێك هەبێ تەنیا کۆنسنانتی وەستاوی گڕی هەبێ . ئەم دابەش بوونە کۆنە لەنێوان کۆنسنانت و ڤاوڵدا ئەبێتە ئەساسی دابەشکردنی کۆنسنانتە وەستاوەکانەو ڤاوڵەکان و بەیەکدا چوونی درکاندن حیساب بۆ گڕی دەنگ وەستاوەکان ئەکا ، ئەگەر هاتوو گڕی بە خاسیەتێکی تەواوی ڤاوڵ بدرێتە قەڵەم وعەلامەتی دەنگە وەستاوەکانیش بەکپی . واتە ڤاوڵێك و فۆنیمێکی وەستاو ئەچنە سەر یەك و فۆنیمێکی دەنگدار پێك دێنن . بەڵام تا ئێستا ئەوە ڕوون نەبۆتەوە کە بۆچی هەندێ ڤاوڵ و فۆنیمی وەستاو ئەچنە سەریەك و هەندێکی تر ناچنە سەریەك .

دەنگی قوڕگیی وەستاو (glohal stop) کە[7] تا ڕادەیەك باس نەکرا لێرەدا ، لەوەیە تۆزێك ڕووناکی بخاتە مەسەلەکەوە . دەنگی قوڕگیی وەستاو لەوەیە لەباتی دەنگی وەستاوی کپ دروست بکرێت (بەتایبەتی ئەو دەنگانەی کە پێیان ئەوترێ alveolar) - (بە پشتی دانەکانی ڕیزی سەرەوەی پێشەوە دروست ئەکرێ - وەرگێر) لە ئینگلیزیی ئەمریکیدا یا لە ئینگلیزیی بەریتانیدا لە حاڵەتی پاش ڤاوڵدا . هەروەها ئەزانم کە دەنگی قوڕگیی وەستاو [?] لەباتی دەنگی وەستاوی گڕ لەهیچ حاڵەتێکی ناخاوتنی مرۆڤی گەورەی ئینگلیزدا بەکار ناهێنرێ . هەندێ نموونە کە دەنگی [?]ی لە شوێنی دەنگی [ت] بەکار ئەهێنرێ وەکو :

(ba?L) bottle

(L ɛ ?r) letter

(na?) Not

ئەم دیاردەیەش تەنگ و چەڵەمە ئەخوڵقێنێ ئەبێ دەنگی قوڕگیی وەستاو چ خاسیەتێکی هاوبەشی هەبێ لەگەڵ دەنگە وەستاوە کپەکاندا کەوا بەکار ئەهێنرێ و لەباتی ئەو دەنگانەو لەگەڵیاندا ئەگونجێ و بەکارئەهێنرێ لەباتی [ت] و نەك [د]؟ - ئەم خاسیەتە بێگومان کپی نییە (ئەو سیمایەی کە هاوبەشی تێدا ئەکەن لەهەموو شوێنێکدا) چونکە هەڵەو گۆڕانی هاوبەشیان گۆڕانی خێرای شوێنی هاتنیانە (دەنگی [?] ناتوانرێ بخرێتە شوێن [ت]ی سەرەتای وشەوە) . ئەو ڕاستیەی کە [?] تەنیا ئەخرێتە شوێنی [ت]ی دوای ڤاوڵەوە ئەوە ئەگەیەنێ کە لێکچوونیان ئەگەڕێتەوە بۆ کارتێکردنیان بەسەر ڤاوڵەکەی پێشیاندا نەك لەناوخۆیاندا وەکو دوو سیگمێنتی جودا .

دەنگی قوڕگیی وەستاو [?] ئەنجامی داخستن و بەیەکهاتنێکی خێرا و یەکسەری تاڵەباریکە بنەڕەتیەکانی قوڕگ و زمانە بچکۆڵەیە . ئەم وەستانە توندەی تاڵەباریکەکانی قوڕگە ئەبێتە هۆی کوتایی بێهاتنێکی توندی ڤاوڵەکەش . ئایا [ت] چۆن لە [?] ئەچێ لەکارتێکردنیدا بەسەر ڤاوڵەکەی پێشیاندا و چۆن و بۆچی کارتێکردنی [د] بەسەر ڤاوڵەکەی پێشیاندا جودایە لەگەڵ [ت] و [?]دا ؟ . سەیری شیکردنەوەی فۆنەتیکی کۆنی (not) و (nod) بکە کەهەر دوو سیگمێنتی کوتایی ئەم دوو وشەیە لەهەر حاڵەتێکدا بەپێی ئاوازە دەست نیشانکراوە .

not = n [a] / [?]
[+ voice] / [- voice]

not = [n] \ [a]
[+ voice] \ [- voice]

nod = [n] / [a] [d]
[+ voice] / [+ voice]

دەنگی وەستاوی [ت] وەکو دەنگی قوڕگیی وەستاو (?) ئەبێتە هۆی کۆتایی بێهاتنێکی کوت و بڕی ڤاوڵەکەی پێشیان . ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ سست بوونی لەڕینەوەی تاڵەباریکەکانی قوڕگ بۆ ڤاوڵەکەی پێش کۆنسنانتە وەستاوەکە (ئەمەش ئەگونجانێکە لە نێوان حاڵەتی [ت]دا کە تاڵەباریکەکانی قوڕگ لە یەك جیا ئەبنەوە بەشێوەیەکی توند و لەحاڵەتی [?]دا بەتوندی دێنەوەیەك . ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە

وەك یەكە لەهەردوو حاڵەتەكەدا بەپێی گۆڕانی [ت] بە [ʔ] . لەلایەكی ترەوە گرێی دەنگی [د] لەوەیە كارتێكردنی ڤاوڵەكەی پێشەوە بێ و لەرینەوەی تاڵەباریكەكانی قوڕگ لەكاتی دەربڕینی ڤاوڵی وشەی (nod) تۆزە تۆزە لەناو ئەچێ ، بەپێچەوانەی لەرینەوەی ئەو دوو ڤاوڵەكەی تر كە ئەتوانێ بچێتە پاڵ كۆنسنانتەكەی پاشی .

خاڵی گرنگ لێرەدا چۆنیەتی كۆتایی پێهاتنی ڤاوڵی پێش كۆنسنانتە وەستاوەكەیە . واتە ڤاوڵ لەپێش دەنگی وەستاوی كپدا بەتوندی كۆتایی پێ ئەهێنرێ و ئەو ڤاوڵەی دوای كۆنسنانتی گڕدێ تۆزە تۆزە كۆتایی پێ ئەهێنرێ . بەلام ئەم بەڵگەیە كە لێرەدا دەست نیشانكرا لەسەر ئەساسی چەند كەرەسەیەكی راستەقینەی لینگویستیكەو شێوەی تیۆریكی بەجێیە ، ئەوەش ئەگەر تاقی كردنەوەی لەگەڵدا بوو ئەوا بە باشترین شێوەی شیكردنەوە ئەژانرێ . وێنەی ئەم دەنگانە بریتیە لە قسەی چەند قسەكەرێكی جیاوازو وتنەوەی برگەی (cvc) - (واتە كۆنسنانت - ڤاوڵ - كۆنسنانت بەجیهاز تاقی كراوەتەوە - وەرگێر) . هەرقسەكەرێك یەكێك لەفۆنیمە وەستاوە كپەكاني وتووەتەوە لەهەر حاڵەتێكدا ئینجا فۆنیمە وەستاوە گیرە دەنگدارەكانی بەرانبەریان . ئەم وێنانە ئەو راستیە پیشان ئەدا كە ڤاوڵی پێش كۆنسنانتی وەستاوی كپ سەرەرای كورتبوونی تا رادەیەك ماوەیەكی وەك یەكیش پیشان ئەدەن . وەئەوڤاوڵەی پێش كۆنسنانتی وەستاو گڕ ماوەكەی تا بەرەو كۆنسنانتەكە بڕوات نەختە نەختە درێژەی پێ ئەدرێ .

ئەم دابەش بوونە لەنێوان ڤاوڵی كۆتایی پێهاتووی كوت و پڕ داو تۆزە تۆزە كۆتایی پێهاتوودا ، لە زمانی ئینگلیزیدا لەوەیە بێتە ئیشارەتێكی گرنگ بۆ دەست نیشانیكردنی جووڵانەوەی تاڵەباریكەكانی قوڕگ بۆ كۆنسناتی كۆتایی وشە . لە زۆربەی نموونەكاندا كۆتایی پێهاتنێكی تۆزە تۆزەی ڤاوڵ لەگەڵ دركاندنی دەنگە كۆنسنانتەكەی دواییدا دەرئەكەوێ . بەم جۆرە ئەبێتە هۆی هەست پێكردنی ئاوازە لەكاتی دركاندنی دەنگە وەستاوە دەنگدارەكە . لەرینەوەی تاڵەباریكەكانی قوڕگ هەر لەكۆنەوە وا هەستی پێكراوە كە دەورێكی گرنگ ببینێ لەهەست پێكردنی دەنگە وەستاوەكاندا ، بەلام لەوەیە راستیەكەی ئەوە بێ هۆی سەرەكی ڤاوڵەكەی تەنیشتی بێت .

ئەگەر ئیشارەتی هەرە گرنگی هەست پێكردنی گڕی دەنگی وەستاوی دوای ڤاوڵ لەو ڤاوڵەدا دەركەوێ ، ئەوا ئەبێ هاوكێشەیەك هەبێ (ڤاوڵی تۆزە تۆزە كۆتایی پێهاتوو) بۆلكاندنی بە هاوكێشەی (مجرد)ی فۆنۆلۆژییەوە [ + گڕی] لە دەنگە وەستاوەكاندا . ئەم یاسایەی خوارەوە بۆ ئەم لكاندنە ئەتوانرێ دابنرێ :




كۆتایی پێ هاتووی لەسەرخۆ .

ئەم هاوكێشەیە بۆ هەردوو لا دەست ئەدا ، هەم بۆ گڕی دەنگە وەستاوەكەو هەمیسان بۆ درێژی ی ڤاوڵەكە لەبەر چەند هۆیەك :

١ - چونكە حیساب بۆ ئەو راستیە ئەكات كە چەند دەنگێكی گڕی وەستاو بەبێ لەرینەوەی تاڵەباریكەكانی قوڕگ ئەدركێژێ و هەندێ جاریش دەنگی وەستاو لەگەڵ كۆتایی پێهاتنێكی لەسەرخۆی ڤاوڵەكەی پێشوویدا دەرئەكەوێ و لەهەندێ حاڵەتی تردا لەرینەوە لەدوای كۆتایی پێهاتنی ڤاوڵەكەدا دەرئەكەوێ و ئەمەش بۆ دەنگە وەستاوەكان بەكار ئەهێنرێ .

٢ - حیساب بۆ درێژبوونی ڤاوڵ ئەكا . بێگومان ئەو ڤاوڵەی لەسەرخۆ كۆتایی پێدێت درێژ ترە لەوەی كوت و پڕ كۆتایی پێ ئەهێنرێت (ئەگەر كۆتایی پێهاتنەكە لەهەردوو حاڵەتەكەوە دەست پێبكات و ئەبێ واش بێ) .

٣ - چونكە ئەگونجێ بۆ سیستەمێكی درێژبوونی لە دوو حاڵەت زیاتری ڤاوڵ . تیۆری درێژبوونی ڤاوڵ لەسەر ئەساسی سیستەمی درێژبوونی دوو حاڵەتی دانراوە ، كەچی سیستەمی زیاتر لەدوو حاڵەتی درێژبوون لەهەندێ دیالێكتدا هەیە - .

٤ - حاڵەتی ئیشارەتی دووەم بۆ گڕی وەیا درێژی ڤاوڵ وەكو ئیشارەتێكی جیاكردنەوە لەناو ئەباو لەباتی ئەم دوو شێوەیە تەنیا ئیشارەتی كۆتایی پێهاتنی لەسەرخۆ وەیا تۆزە تۆزە بەكاردێت .

٥ - حیساب بۆ دەرکەوتنی گڕی لەنێوان دەنگی وەستاوی گڕی سەرەتای وشە ئەکات بەبێ گەڕانەوە بۆ نیشارەتی ئاوازەی سەرەکی . لەم حاڵەتەدا حیساب بۆ گڕی دەنگ ئەکا وەکو پێش کەوتنی ڤاوڵەی پێشی . چونکە بۆ نموونە [ب] ناتوانرێ تەفسیر بکرێ لە درکاندنێکی سەربەخۆدا و ئەبی لەگەڵ ڤاوڵێکدا بووترێتەوە ئینجا لێک بدرێتەوە لەوەیە لەرینەوەی تاڵەباریکەکانی قورگ لەکاتی درکاندنی دەنگێکی لێویدا دەربکەوێ ، بەلام قسەکەرێکی زمانە که ناتوانێ بەتەواوەتی هەستی پێبکات ، بۆ نموونە دەنگی [ب] .

لە ئەنجامدا وا دەر ئەکەوێ کە کۆتایی پێهاتنی ڤاوڵ نیشارەتێکی گرنگ ترە لە درێژی ڤاوڵ وەیا لەرینەوەی تاڵە باریکەانی قورگ لە کاتی درکاندنی دەنگی وەستاودا بۆ جیا کردنەوەی دەنگی گڕو کپ . واتە کۆتایی پێهاتنی لەسەرخۆو کوتو پڕ نیشارەتێکی فۆنەتیکی گرنگە بۆ ئەوەی دابنرێ بەرانبەر بە نیشارەتی فۆنۆلۆژی [± گڕی]و ئەمەش بوونی گڕیو درێژی ڤاوڵ ئینکار ناکات وەکو نیشارەتێکی هەست پێکراو ، بەڵکو ئەوە ئەگەیەنێ کە هەردووکیان ئەنجامی کار تێکردنی کۆتایی پێهاتنی لەسەر خۆیە کە تەنیا نیشارەتەکە پەیوەندی نێوان گڕی لە دەنگی وەستاوی پاش ڤاوڵو درێژی ڤاوڵەکەی پێشی روون ئەکاتەوە . بەلام هێشتا ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لێرەدا پێش چاو خرا کۆتایی بە مەسەلەکە نامێنێ ئەگەرچی ئەنجامی دیراسەی برگەی [CVC]ە بەشێوەیەکی تەواو ؛ بەلام ئەوەی لێرەدا باس کرا - ئەبێ وەکو سەرەتایەك سەیر بکرێ بۆ پشکنینێکی دوورو درێژترو هەرگیز بە کۆتایی لە قەڵەم نادرێ .

## پەراوێزەکان

١ - مەبەست لە فورسێتی هەوا ئەوەیە کە هەندێ دەنگ لە دەنگەکانی بەشی کونسنانتدا هەوایەکی فورسی لەگەڵدا دروست ئەبێ لە کاتی درکاندندا ، وەکو دەنگی وەستاوی [P] لە وشەی (Par)دا وەشێوە فۆنەتیکیەکەی بەم جۆرە ئەنوسرێتەوە [Phaar] . (وەرگێڕ) ئەم فورسێتیەش پێی ئەوترێ (Aspiration) .

٢ - زانیاری قسەکەرو بیستەر دەربارەی زمان (linguistics competence) بریتیە لەو کۆمەڵە دەستوورە کە لە مێشکی قسەکەرو بیستەردا وێنە کێشراوەو توانای بەکار هێنانی ئەو دەستوورانە بۆ دەربڕینی بیر . (وەرگێڕ) .

٣ - لە وەرگێڕانی ئەم وتارەدا تێرمی ئاوازەو گڕیو دەنگدار بەکار هێنراوە بۆ هەمان مەبەست . هەروەها بێ ئاوازەو کپیو بێدەنگ بۆ هەمان مەبەست . (وەرگێڕ) .

٤ - مەبەست لە نیشارەتی هەست پێکراوی تەواو ئەوەیە کە قسەکەرو بیستەر هەست بە بوونی ئەو درێژ بوونەوە یا ئەو کورتیەی ڤاوڵە بکات ، یا هەر دیاردەیەکی تر کە لە دەنگێکدا یا لە دەنگەکانی وشەیەکدا سەر هەڵ ئەدا .

٥ - یەکەم دەنگی [ب] لە برگەی [bvb]دا تۆزە تۆزە گڕ ئەبێ واتە لە سەرەتاوە بە بێدەنگی دروست ئەبێو ئینجا بە ڤاوڵەکەوە ئەبێتە دەنگدارو دووەم دەنگی [ب] لە هەمان برگەدا لە سەرەتای دەربڕینیدا دەنگدارە ئینجا بەرە بەرە ئەبێتە بێدەنگ . - (وەرگێڕ) .

٦ - بەیەکدا چوونی درکاندنی دەنگ (Coarticulation) ئەتوانین بەم شێوەیە روونی بکەینەوە : ئەگەر لە شێوەی نووسینەوەدا (واتە رێنووس) سەیری هەرپیتێك بکەین ئەبێ تەنیا وەکو وێنەیەکی پەتی حیسابی بۆ بکرێو ئەگەر لە فۆنۆلۆژیدا سەیر کرا ئەبێ وەکو فۆنیمێك حیسابی بۆ بکرێو بە شێوەیەکی (مجرد)ی دوور لە راستیی دەنگ . بێگومان لە فۆنۆلۆژیدا هەر زمانێك بریتیە لە چەند فۆنیمێکی دیاری کراوو دەست نیشان کردنیشی لەسەر ئەساسی هەست پێکردن ئەکرێت . بەلام هەر زمانێك بریتیە لە چەند دەنگێك کە لە راستیدا لە ژماردن نایە چونکە پێی تاقیکردنەوە تەنیا دەنگێك ئەگەر زیاتر لە جارێك وترایەوە ئەوا ئەو دەنگە لە هەردووجارەکەدا وەکو یەك نابێ . هەروەها ئەو دەنگانەش چی ڤاوڵ بێ یا کۆنسنانت لە ئاخاوتندا کار ئەکەنە سەر یەکدی چونکە دەنگ لە ئاخافتندا وەکو زنجیر وایە ، دەنگێك ئەچێتە ئەوی ترەوە . بەم جۆرە ڤاوڵێك یا بەشێوەیەکی دروستتر خاسیەتی ڤاوڵێك تێکەڵ بە خاسیەتی کۆنسنانتێك ئەبێ ، یا بە پێچەوانەوە وەیا خاسیەتی ڤاوڵێك تێکەڵ بە خاسیەتی ڤاوڵێکی تر ئەبێ ، لە هەموو حاڵەتێکدا لە چەپەوە بۆ راستو لە راستەوە بۆ چەپ . دیاردەی تێکەڵ بوونی درکاندن لە هەموو زمانێکدا روو ئەدا ، چونکە هۆی سەرەکی ئەم دیاردەیە لە راستیدا ئەگەرێتەوە بۆ شوێن دروست بوونی دەنگ لە ناو زارو قورگداو هەمو دەنگەکان لە رووی دروست بوونەوە شوێنێکی تایبەتیان هەیە ، واتە ئەندامێك یا زیاتر لە ئەندامێکی دروست کەری دەنگ بەشداری ئەکات لە دروست بوونی دەنگێکدا دەنگێك بە یەك شێوە جودایە دەنگێکی تر وەیا لەیەك شێوە زیاتر . ئەو نزیك بوونەی جێگای دروست بوونی دوو دەنگ ئەبێتە هۆی تێکەڵ بوونی ئەو دوو دەنگە زیاتر لەو دەنگانەی کە جێگای دروست بوونیان لە یەکەوە دوورترە . ئەم دیاردەیەش کە تێکەڵ بوونی خاسیەتی دەنگ ئەگرێتەوە پێی ئەوترێ (Coarticulation) - (وەرگێڕ) .

٧ - دەنگی قورگی وەستاو [P] (glottal stop) (همزە)ی عەرەبی ئەگرێتەوە . ئەم دەنگە لە زمانی ئینگلیزیدا فۆنیم نییە چونکە تەنیا لە هەندێ دیالێکداو لە هەندێ وشەدا دەر ئەکەوێ . لە زمانی کوردیدا تەنیا لە پێشی وشەدا دەر ئەکەوێو تێکەڵ بە ڤاوڵێکی تر ئەبێ وەکو /ا/ و /ی/ .. هتد وە هەرگیز بە فۆنیم نازمێردرێ لە زمانی کوردیدا . کەچی لە زمانی عەرەبیدا ئەتوانرێ وەکو فۆنیمێك لە قەڵەم بدرێ ، چونکە لە سەرەتای وشەو ناوەڕاستو کۆتایی وشەدا دێت بە شێوەیەکی یەجگار زۆر - (وەرگێڕ) .

هەڵبەستی بلە

ئاوازی کۆن
ئامادەوگوتنی وریا ئەحمەد

# گۆرانی پەیمان شکێن

شەوێ بەیادی ژینی ڕابوردوو
بەیادی عومری گوڵی بابردوو
سەرێ بکێشە هەوارگەی وێران
کە تاریکترە لە دیدەی کوێران

* * *

بزانە مەستی شەرابی چاوت
گیرۆدەی داوی ئەگریجەی خاوت
لە جێی تۆ خەمی گرتۆتە باوەش
زاری و بێخەوی بوونە برابەش

* * *

یاران هەروەها پەیمان شکێن
هەروا بێ قسەو وابێ بەڵێن
یاهەر تۆ وەهای تۆش لە بەختی من
ڕاستی پەیمانت لێ بۆتە دوژمن

---

ئەم گۆرانی‌یە یەکێکە لە بەرهەمە سەرەتاکانی تیپی مۆسیقای بلواجی کۆیە ، کە لە تەلەفزیۆنی بەغدا تۆمارکرا سالی (١٩٧٢) .

FIN | D.C

# گۆرانی بازان

بازان باز قەتار قوڵنگان حەوایی		بە ماچو دوو ماچ لێت نابم رازی
حەیفم بۆ بالات شەو بە تەنیایی		تا لەسەر سینەت نەیکەم دەسبازی
دوگمەڵێ وەی وەی دوگمەڵێ چەشمی سیا کوچەڵێ		دوگمەڵێ وەی وەی دوگمەڵێ چەشمی سیا کوچەڵێ
ئەم قەلە مەرپۆ مانگ هەڵێ شەوێت دێمە باخەڵێ		ئەم قەلە مەرپۆ ئایشێ لەسەر سینەم پاکشێ

---

ئەم گۆرانییە لەگەڵ تیپی مۆسیقای باواجی کۆیەدا تۆمار کرا بۆ تەلەفزیۆنی کەرکووك سالی ١٩٧٣ ز .

Andante

# ئەكتەرو شانۆ

●

نووسینی ـ ئەحمەد سالار

●

**مەزنە هونەرمـەندی فـەرەنگ ( ژان لووی بـاغۆ ) ووتی : ( بۆیە پیشەی ئەكتەریم كردۆتە پیشە تا هۆو ڕێگای گەیشتن بەبرا مرۆڤەكانم ببینمەوە [3]) .**

دەمەوێ لەو هونەرەوە بدوێم كە كەسانی شانۆنامـە نمایش دەكات ، واتە كاری ئەو هونەرمەندەی لەنێـوانی نووسـەرو جـەماوەردا دەبێتـە پرد ، بـەڵام پـردێكی زیندووی پڕ لە هـەڵچوون‌و هێـزی گیان بـەبەرداكـەر ، هـەر چـۆن كـارو فرمانەكەی ئەفراندن‌و دروستكردنە ، بەبیرو بەهرەو توانا سـروشتی‌یەكـانی‌یەوە دەبـزوێ‌و ڕەنـج دەدات ، لە پـای دروست كردنەوەی كەسە شانۆیی‌یەكە .

ئـەكتەر تـوخمێكی سەرەكی تـەواوكەری ( درامـا ) یـە ، ( درامـا ) ش شـێـوەیـەكـە لەشێـوە هـۆشـیـاری‌یـە كۆمەڵایەتیەكان ، جۆرێكە لە چالاكی‌یـەكانی مـرۆڤ ، ژیان بەباری گوزەرانەوەو لەشێـوەو ڕوویەكی نـوێی‌ی هونـەردا پیشان دەداتەوە ، دادەنرێت بە یەكێك لە هەرە گرنگترینی هویەكانی فێربوون‌و وێنەكێشانی جوانانەی ژیان ، هونەرێكە گۆڕان‌و پەرەسەندنی نوێی‌بوونـەوەی بەو گـۆڕانكاریـانەوە بەستراوە كە هەر دەم لەباری ئابووری كومەڵگاكەی‌دا ڕوو دەدات ، ئەمە گەوهەری ڕێڕەوی مێژوویەتی .

هونەری ( دراما ) خاوەنی ڕەگ‌و ڕەچەڵەكێكی دوورو درێژی چاك بەناخی رابوردودا چووی هەیە ، وەنەبێ هەروا كتوپڕ لەخۆڕا هاتبێتە گۆڕێ ، لەو بڕوایەدام هەر لەسەرەتاوە ، یان بابڵێین لە ڕۆژانی سەرەتاو ساكاری‌یەوەی ، ئەو ڕۆژگارەی دەچێتەوەبۆ هەزارەها ساڵ ، تۆووكـەراو توخمی كـەرەسە سەرەكی‌یەكانی تیادابووە ، بەڵام بـوونەكـە لە رادەی نەك تەواوبوون‌و گەیشتن بەڵكو لە رادەی چەكەرەشدانە بوون ، تا ئەو كـاتەی زەمینـەو ئاوو هـەوای وادەی سەوز بـوون‌و سەرهەڵدانی ڕاستەقینەی بۆ سازاوە .

پرۆفیسۆر ( ئـۆهارا ) مـامۆستـای زانكۆی ( شیكـاگۆ ) لە كتێبەكەیدا ( The hand book of drama ) توخمە سەرەكی‌یەكانی دروستبوونی درامای بەسەركردۆتەوە كـاتێ دەڵێ : ( هەر لەسەرەتای پەیدابوونی دراماوە سێ توخمە سەرەكی‌یەكەی كە نووسەرو ئەكتەرو جەماوەرە هاوبەشیان كردووە )[4] .

پاشان هەمان پرۆفیسۆر ئـەو راوچی‌یە كـۆنەی بـەنموونـە هێناوەتەوە كـە چۆن كـاتێ لەراووشكار گـەڕاوەتەوە سـەر گوزشتەكەی بۆ خێزان‌و كەسانی دەوروبەری گێڕاوەتەوە ،

ئەو دەمە کابرای راوچی دەبووە نووسەرو ئەکتەرو کەسە گوێگرەکانیش جەماوەر . بەڵێ ئەمانە وەك توخمو تۆوی سەرەتا ، بەلام لەکەیدا خۆیدا لەوادەی خۆ گرتن و لە دایکبوونی تەواوەتی ؟ . ئەمەیان پەیوەندی بەو ئەزموونانەیا رەنگ و رووی نوێیان پێ بەخشی .

گەلێ راوبۆ چوون دەربارەی جۆرو هۆیەکانی سەرهەڵدانی هاتە ئاراوە ، بەلام ئەوەی شایانی باسەو بەتەواوی راستبۆتەوە ، ئەوەیە کە لە ولاتی ( گریك ) و لە رۆژانی گەرمو گوڕو تاڤە تاڵ ئاینە ( دیۆنیزیۆس ) یەکەدا کەوتە خۆگرتن و ئەشونماکردن ـ ئەو ئاینە دەورێکی یەکجار گەورەو گرنگی هەبووە ، هەر چۆن لە گەوهەری داستانی خوداوەندەکەیدا چیرۆك و سەرگوزەشتەیەك بەیاد دەکرێ کە کتومت بە ژیانی رەز دەچێ ، بە هەمان خولو ژیاندا

رادەبوورێ ، وەك رەنگ زەردی خەزان و مەرگی زستانەو جارێکی دی ژیانەوەی بەهاران و چرۆو گوڵکە دەرکردن ، ئیتر ئەمە خۆشی و ناخۆشی ، خەندەو هەنسك ، قاقالێدانی پێکەنین و پرمەی قوڵی گریان و شین و شەپۆڕو چەمەرە ، دوو رووی دژبە یەك ، ئاوەژوو ، ئەم دوو لایەنە بوونە خولقێنەری دوو رووە ئەمرکەی ( دراما ) واتە ( تەراژیدیا ) و ( کۆمیدیا ) .

ئەم تەماشاکردنەو ئەم ژان و ژیانە ئاینی یە بووە کەرەسەو پەروەردگاری ( دراما )، دایکێکی کۆشکەرە .
ئەو کەسانەی بەسەرهات و سەرگوزشتەکانیان نمایش دەکردو دەنواند ، کەسانێك بوون لەریزی پیاوە پیرۆزە ئاینی یەکان ، کەواتە زادەی عەنعەناتی ئاینەکەیە ، ئەم خاڵە خاڵێکی دیارو گەواهە بۆ شایەتی دانی وەرگرتنی شوناسنامەی دراما ، ئەوەتا زانای شانۆناس ( ئەلارداس نیکۆڵ ) یش لە هەمان بڕوادایە ( کە هەر لەو گۆرانی و سروودانەی گریکیەکان لە بەختکاکانیاندا دەیان گووتەوەو بەسەرهاتی خۆش و ناخۆشی دەگێرایەوە ئەم هونەرەی لێکەوتەوە (*) .

لەکاتیکدا بەدوی شوێن پێی یەکەم هەنگاوەکانی ئەکتەرەوەین خۆمان لەبەردەم هونەرو هونەرمەندێکدا دەبینینەوە کە ئەرکە هونەریەکەی بەشێك بووە لە ئەرکی هونەرمەندە ئەکتەرەکەمان ، ئەویش سەماکەرە ، هونەری سەما هونەرێکی کۆنەو هۆیەك بووە لە هۆیەکانی دەربڕین ، لەکاتێکدا زمانەکانی دی دەربڕین لەدایك نەبوون ، رۆژان هات و رۆژان چوو هونەرمەندێ پەیدابوو خاوەنی سەرمایەکی دەوڵەمەند ، خاوەنی کەرەسەیەکی زیاتر ، ناونرا ئەکتەر .
با بگەرێینەوە لای عەنعەنات و نەریتە ئاینی یە گریکیەکە ، ئەوەبوو بابەتی شاعیرەکە ، واتە گێرانەوەو بەسەرکردنەوەی سەرگوزەشتە ئاینی یەکە لەلایەن ( کۆرس ) وە پێشکەش دەکرا ، ئەمە لە جەژنی ( لینایە ) یان جەژنی ( دیۆنیزیا ) بوایە .

**لەو رۆژەوەی (سیسپس ـ ThesPis ) لەکۆرس جیابویەوە گەورەترین رووداو لەمێژووی هونەری ئەکتەردا رووی دا ، ئەکتەر پەیدابوو ، ئەم رۆژە دادەنرێ بە رۆژی لەدایکبوونی ئەم هونەرە . ئەومندەی ئاگادارین** لە ساڵی ( 535 ـ پ . ز ) دا ئەم هونەرمەندە خەلاتی یەکەمی لەیەکەم فیستیڤاڵی تەراژیدیادا وەگرت . گرنگ ئەوەیە ئەم هونەرمەندە دەروویەکی نوێی کردەوە کە رۆژ بە رۆژ لە گرنگ و دەوری ( کۆرس ) کەمتر دەبووەوە ، ئەوەبوو ( ئەسکیلیۆس ـ 525 پ ـ ز ـ 457 پ ـ ز ) ی شاعیری شانۆ ئەکتەری دووەمی خوڵقاند ، واتە دوو کەسی دانا بۆ رایی کردنی شانۆنامەکانی ، دوا بەدوای ئەم شاعیرە مەزنە شاعیرانی دی سێ ئەکتەریان دادەنا ، هەر ئەکتەرەش ناوێکیان لێنابوو ، بەیەکەمیان دەگووت ئەکتەری یەکەم ( Protagonist ) پاشان بە قارەمانی شانۆیی ناو دەبرا ، بە دووەمیان دەگووت ( Deutreragonist ) ، بەم جۆرە ناوزان ..

وەنەبێ ( سیپس ) تاکە ئەکتەرێکی گریك بووبێ بەڵکو ناوی گەلێکی دی وەك ( ئەسکیلیۆس ) ی شاعیرو ( سۆفۆکلیس ـ 496 ـ 405 پ . ز ) شاعیرمان پێگەییوە ، ئەم دوو شاعیرە خۆیان دەوری سەرەکی شانۆنامەکانیان یاری دەکرد .

لێرەدا پرسیارێ خۆی دەسەپێنی ، دەڵێ ئەی دەوری ئافرەت لەم بوارەدا چی بووە ؟ . ئەکتەری زانراوە ئەوەیە لەسەرەتاوە هەر ئەکتەری پیاو دەوری ئافرەتی نمایش دەکرد ، تا سەردەمی رۆمانیەکان ، ئەوسا ئافرەت هاتە سەر شانۆ ، بەلام ئەم ئافرەتانەی لە پلەیەکی کومەلایەتی نزمدابوون . لە شانۆو رۆژگاری ( ئەلیزابیس ) دا منالی دەنگ ناسك دەوری ئافرەتی دەبینی ؛ بەلام شانۆی ( ئیسپان ) و ( ئیتالیا ) و ( فەرەنگ ) لەسەردەمی سەدەی شانزەوە ئافرەتی بەخۆیەوە دیووە ، بەلام شانۆی ( ئینگلیز ) سالێ ( 1660 ـ ز ) ئافرەتی دیووە ، شانۆی ( عەرەب ) یش کە دەگەرێتەوە بۆ سالی ( 1848 ـ ز ) کە ( مارون نقاش ) لە شاری ( صەیدای ) ی ( لوبنان ) شانۆنامەی ( پیسکە ) ی پێشکەش کرد ، ئەو رۆژکارە رێگای هاوبەشی ئافرەتی نەدەدا ، بەلام شانۆی میسر پاش شانۆکەی لوبنان ئافرەتی هاوکاری کردووە هەر لەسەرەتاوە ، واتە لەوکاتەوەی

( یعقوب ضوع ) بنیاتی نا ـ ئەگەر سەرنجێکی خانۆی شانۆی ئەو رۆژکارە بدەین کە ئەو رۆ بەهۆی سێ سەرچاوەی زێدووەوە لێی دەگەین و بەتەواوی بۆمان دەردەکەوێ ، یەکەمیان ئەو پارچە سیرامیکە کۆنانەی یادگاری ئەو رۆژگارانەن و وێنەی بینراوی شانۆیی یان لەسەر نەخشێنراوە ، یان ئەو شانۆنامانە زادەی بیری ئەودەمەن ، سێیەمیان شوێنەواری شانۆکانە ، بۆ نموونە شانۆی ( ئەپیدۆرس ) ، فراوانی و گەورەیی ئەوشانۆیانە گەواهی جەماوەرێکی زۆرمو ئەو هەقیقەتەش دەسەلمێنێ کە ئەکتەری ئەو کاتەش مرۆڤێکی ئاسایی هەرەمەکی نەبوون ، بەلکو کەسانێکی کارامەی بەهرەداری قالبووی مەشق و خوێندن ، شانۆیەك جێگای بیست سی هەزار کەس بێ دەبێ خاوەنی ئەکتەری دەنگ بەهێزو زولال بێ ، لەهەلس وکەوت و جوولاندنەوەشدا لەشێکی گەورەو جوان و بەهێز ، جگەلەوەی

پێلاوی پاژنە بەرزیان لەپێ دەکرد ، پێیان دەگووت ( کۆسورنۆس ) ، دەمامکی گەورەشیان بەکاردەهێنا کە بە

( لاونکۆس ) ناودەبرا ، لێرەدا ئەوە دەخەمەوە بیر کە لای گریکیەکان نمایش کردنی شانۆ کارو کاسبی و پیشە بووە ، واتە سەرچاوەی گوزەران و ژیانی ئەو هونەرمەندانە بووە ، لەهەردوو قۆناغە سەرەتایی یەکاندا چ لەو قۆناغەدا ئاینی بوو ، یان لەوکاتەدا بووبووە کارێکی ژیان ، جەماوەر تکتی شانۆی دەکڕی ، نرخی تکت لە دراخمایەکەوە[4] تا چەند دراخمایەك بەپێی ئەو سێ جۆرە جێگای دانیشتنەی هەبوون ، ئەو تکتانە لەقورقوشم دروست دەکران و نیشانەی شوێن و شانۆکەی لەسەر مۆرکرابوو[5] .

پەراوێز :

1 — لێون شانۆریك ـ تاريخ المسرح ـ ترجمة خليل شرف الدين ـ ص218

2 — د جميل تكريتي ـ محاضرات في تاريخ المسرح ـ ص ـ 2

3 — الاريس نيكول ـ علم المسرحية ـ ص ـ 17 .

4 — دراخما : پارەیەکی کۆنی گریکیەو ووشەی ـ درهم ـ لەوەوە وەرگیراوە .

5 — لەمۆزەخانەی شاری ئەسینادا دانراوە .

سەرچاوەکان :

1 — شلدون تشيني ـ تاريخ المسرح في ثلاثة الاف سنة ترجمة دريني خشبه مراجعة علي فهمي ـ قاهرة ـ عام ـ بلا .

2 — فرانك ـ م ـ هوايتج ـ المدخل الى الفنون المسرحية ـ ترجمة مجموعة مترجمين قاهرة 1970 ـ

3 — د . عبدالمحسن الخشاب ـ التياترو القديم ـ قاهرة ـ 1971 .

4 — ليون شانصوريل ـ تاريخ المسرح ـ ترجمة خليل شرف الدين .

5 — د . ابراهيم سكر ـ الدراما الاغرقية ـ قاهرة ـ 1966 .

6 — د . ابراهيم سكر ـ الدراما الرومانية ـ قاهرة ـ 1966 .

7 — د . ابراهيم حمادة ـ معجم المصطلحات الدرامية ـ قاهرة ـ 1971 .

• بیرەوەری

ـ کاوەی ئەحمەد میرزا ـ

# کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی پێشوو و چەند بیرەوەریەك

لە ساڵی ( 1956 )داو بە دەستپێشکەری‌ی مامۆستایان رەفیق چالاك‌و نوری وەشتی ، لە سەر شانۆی سانەوی کوڕان لە شاری سلێمانی شانۆیی‌ی ( پیسکەی تەڕ پیر ) پێشکەش کرا ئەم شانۆیی‌یە لە نووسینی ( مۆلێر )ە ، رەفیق چالاك بە هاوبەشی نوری وەشتی ئامادەیان کردبوو لە بەرگێکی خۆماڵیدا پێشکەشیان کرد .. لەم شانۆیەدا کوڕگەلێکی سەرگەرم‌و هونەر دۆست هاو بەشیان کرد ، منیش بە هۆی برادەریم لەگەڵ کاك ( طه خلیل )دا هاوبەشیم بە شێوەی مولەقن ) هەبوو .

هەر ئەم شانۆیەش بوو بیری پێك هێنانی کۆمەڵێکی هونەری‌ی لای مامۆستایان چالاك‌و وەشتی دروست کرد .. خولیای کۆمەڵێك ـ کە تا ئەو کاتەش ناوەکەی بۆ دانەنرابوو ـ لە مێشك‌و دەروونی هونەرمەنداندا گینگلی ئەدا .. ئەوەی من لە یادم مابێ‌و لای خۆمەوە ئاگادار بووبم ، دوا بە دوای پێشکەش کردنی پیسکەی تەڕپیر ، جەماعەت جەم کراو هونەر دۆستان کۆبوونەوە ، لە لایەکی تریشەوە تیپی مۆسیقای مەولەوی کە مامۆستا ( قادر دیلان ) پێشڕەوایەتی دەکرد ، ئەو بیرەیان لا پەسەند بوو(1) .

دەستەو برد بەپەرموی ناوخۆ سازکراو بە ناوی ( کۆمەڵی هونەرە جوانەکان )ەوە داوای مۆڵەت لە میری کرا(2) . لەبەر ئەوەی کاك رەفیق بە دەم‌و کارامە بوو ، ئاشنایەتی لەگەڵ کاربەدەستاندا هەبوو ، توانی ئەو بینایەی دەکەوێتە تەنیشت پەروەردەی سلێمانیەوە ( باخچەی ساوایانی کۆن ) وەربگرێت‌و بێتە یەکەم مەڵبەندی کارکردنی کۆمەڵی هونەرە جوانەکان ، تەنانەت بەر لەوەی بە شێوەیەکی رەسمی مۆڵەتی کارکردنی پێ بدرێت .. هەر لە هەمان سەڵداو ماوەیەکی ئەوتۆی نەخایاند بە رەسمی مۆڵەت بە کۆمەڵ درا ..

**ئەوەی لە دوو توێی یادما مابێت ، دەستەی دامەزرێنەر جگە لە هەردوو مامۆستایان رەفیق چالاك‌و نووری وەشتی ئەم برایانە بوون : ( قادر دیلان ، نەجاتی عەبدە ، رەئووف یەحیا ، حاتەم سەعید ، خالد سەعید ، ولیم یوحنا ، ئازاد شەوقی ، جەمال بەختیار ، بەهجەت رەشیدی سەعاتچی ، طه خلیل ) .**

هەر دوا بە دوای مۆڵەت پێدانی کۆمەڵ‌و بە بۆنەی دامەزراندنیەوە ، ئاهەنگێکی مەزن‌و قەشەنگ لە باخچەی کۆمەڵدا سازکرا ، بۆ ئەم ئاهەنگەش نزیکەی مانگێك کۆمەڵ خۆی بۆ ئامادە کردو لە هەموو سووچێکی کوردستانەوە هونەرمەنداو رۆشنبیران بانگ کرابوون ، لەوانە خوا لێخۆشبوو ( سێوە )و ( بێکووری )و دەیان رۆشنبیرو هونەر دۆستی تر ، ئاهەنگەکەش بە سرووودی کۆمەڵ کرایەوە کە ئاوازەکەی رەفیق چالاك داینابوو(3) .

ئەو تیپەشی مۆسیقای سروودەکەی دەژەند ، جگە لە هونەرمەندانی ( مەولەوی ) چەند هونەرمەندێکی تر هاوبەشیان تیا کرد ، لەو مۆسیقا ژەنانەی سەر بە تیپی هەوایی‌ی سەربازی بوون . لەوانەی ناوەکانیانم لەیاد ماوە ( کاك نووری ) کە ئێستا برین پێچە لە خەستەخانەی سلێمانی ، ( شەوکەت رەشید ) ، ( کاك حەمە صالح ) ناوێك ، خۆشم لەو سروودەدا کۆرس بووم ..

پاش ئاهەنگی دامەزراندن بە ماوەیەك ، یەکەم هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەر ساز کرا ، ئەنجامی هەڵبژاردنەکە ، رەفیق چالاك بووە یەکەم سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەر ، ئەم برایانەش

بوونە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر : ( نووری وەشتی ، قادر دیلان ، رەئووف یەحیا ، جەمال بەختیار ، حاتەم سەعید ، خالد سەعید ، ئازاد شەوقی ، طە خلیل ) .

زۆری پێ نەچوو ، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرەوەو بە هاندانی رەفیق چالاك ، نامەی ناڕەزایی دەربارەی ( رەئووف یەحیێ ) بەرز کرایەوەو بە زۆربەی ئەندامان ئیمزا کرا ، ئەنجامەکەشی بە لابردنی کۆتایی پێ هات .

لە ماوەی دامەزراندنو شۆڕشی چواردەی تەمووزدا ، کۆمەڵ چەند بەرهەمێکی هونەری پێشکەش کرد ، لەوانە ، دووبارەکردنەوەی شانۆیی ( پیسکەی تەڕپیر ) بوو کە هەمان ئەکتەرەکانی پێشوو دەوریان تیا دەبینی(4) .

دووەم جاری شانۆییەکە ، کە لەسەر شانۆی سینەوی پێشکەش کرا ، موتەصەریفی سلێمانی چاودێری دەکردو لەیەکێ لە رۆژانی پێشکەش کردنا ، سەعید قەزاز کە وەزیری ناوخۆ بوو ، بەشداری بینینی شانۆییەکەی کردو پەنجا دیناری پێشکەش کرد .

لەو شانۆییانەی لە ماوەی ناوبراودا پێشکەش کرا ، شانۆیی ( گلکۆی تازەی لەیل ) بوو(5) .. هەروەها بۆ جارێکی تر شانۆیی ( پیسکەی تەڕپیر ) پێشکەش کرایەوە ، هەندێ لە ئەکتەرەکانیشی گۆڕا بوون(6) ..

لێرەدا بە پێویستی دەزانم شتێ دەربارەی رادەی هونەریو چۆنێتی پێشکەش کردنی ئەو شانۆییانە باس بکەم کە کۆمەڵ دەی خستنە سەر شانۆ ، هەرچەندە نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە لە نێوان ئیمڕۆو ئەو سەردەمەدا جیاوازیەکی ئێجگار زۆر هەیە ، لەو دەمەدا نە قوتابخانەی هونەری بۆ پێگەیاندنی هونەرمەندان هەبوو ، بشبوایە تاکو تەرا قوتابیی کورد رووی تێ دەکرد ، لەبەر ئەوەی ئەو قوتابخانانە لە پایتەخت بوونو بوونو دەرامەت ڕێی زۆر کەسی نە ئەدا ئەو ئەرکە قورسە هەلگرێ ، یان ئەوەندە بایەخ بە هونەر نەدرابوو ، بەڵکو ئەتوانم بڵێم لەو سەردەمەدا بە چاوێکی سووکەوە سەیری هونەرمەند دەکرا ، لای زۆربەی زۆری خەڵکی بە گاڵتە جاریو ڕیسواییەوە دەیان ڕوانیە هونەرمەندان ، بە پێچەوانەی ئەمڕۆوە کە بە چاوی ڕێزو بایەخ پێ دانەوە سەیری ئەو لایەنە گرنگە ئەکەن ، ئەمە جگە لەوەی ڕادەی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتی رۆژ دوای رۆژ لە پێشکەوتندایە ، ئەم لایەنەش کاری تەواو دەکاتە سەر بزووتنەوەی هونەری ، بەڵکو پێشکەوتنی هونەر بەندە بە پێشکەوتنی کۆمەڵەوە ، هەرچەند هونەر خۆی دەتوانێت لەو گۆڕانکاریو پێشکەوتنەدا دەوری باڵا ببینێ .

**ئەو کاتە هونەرمەندان تاقی کردنەوەی لەوەو پێشیان نەبووە ، بە دەگمەن یەکێ یان دوان ، یاخود دوو بەرهەمی شانۆیی لە پایتەختدا بینیبێت ، کە ئەمەش لە پێشکەش کردنی شانۆییەکانی ئەو سەردەمەدا ڕەنگی دەدایەوە .**

دەربارەی شانۆش ، ئەوە بە تەنیا هەر شانۆی سانەوی کوڕان تاقانە بوو . هەموو بەرهەمەکان لەوێدا پێشکەش دەکران. ئەو شانۆیە هیچ جۆرە ئامێرێکی تەکنیکی تێدا نەبوو کەڵکی لێ وەربگیرێت ، کۆمەڵ بەپێی توانا هەولی دەدا لەشتی سادەو ساکار بیان ڕەخسێنێت . شێوەی دیکۆر لەوەو پێش زۆر ساکار بوو ، کاك جەمال بەختیار چەند نیگارێکی لەسەر پەردەیەکی پانو پۆڕ دەکێشاو ئەوجا بە ئەلقەو تەل هەڵ دەواسرا(7) .. بۆ یەکەم جار لە شانۆیی پیسکەدا ( دیکۆری موجەسەم ) هاتە کایەوە ، کە ئەمەش گۆڕانکاریەکی باش بوو ، یەکەم جار بوو شانۆ ئەو جۆرە دیکۆرە ، بەخۆیەوە ببینی(8).

لەو سەردەمەدا ، دەرهێنان ئەو دەورەی نەبوو کە ئەمڕۆ دەیگێڕێ ، ئەکتەرەکانیش هەر یەکە بەپێی بۆچوونو سەلیقەی خۆی هەڵسو کەوتی دەکرد ، دەرهێنەر ـ گەر بە پێوانەی ئەمڕۆ بڵێم دەرهێنەر بووە ـ تەنها چەند ئامۆژگاریەکی دەکردو هەندێ جاریش ستایشو ئافەرینی دەکرد(9) .. بایەخ زۆر نەدەدرا بە دەنگو لەش کە دوو هۆی بنەڕەتین لە نواندندا ... زۆر جار دەنگی ئەکتەرەکە لە هۆڵەکەوە نەدەبیسترا ، هۆی ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ گەڕە لاوژێو هەراو هوریاو قەزوان قرتاندنی ناو هۆڵەکە ، بە تایبەتی لە شەوی ژنانا !..(10) ئەبوایە ئەکتەرەکە هاواری بکردایە ، زۆر جار ئەنجامەکەی بەدەنگ نووساندن ئەهاتەوە !.. ئەوەی لەناو هەموو ئەکتەرەکاندا بەختەوەرو دەنگی زوڵاڵ بوو ، کاك رەفیق چالاك خۆی بوو، چونکە جگە لەوەی دەنگێکی لەبارو خۆشی هەبوو ، میکرۆفۆنێکی بەسنگیەوە ئەبەست ، کە بەهۆی وایەرێکی زۆر درێژەوە لە ئیمپلیفایەرەکەوە ڕائەکێشرا ، هەر کاك رەفیق دایەلۆژێکی دەگوت ، گورج هۆڵەکە بێ دەنگ دەبوو ، مەگەر پێکەنینو چەپڵە بەسەریا زاڵ ببوایە ، لەبەر ئەوە ئاهەنگی شانۆییەکە ( ایقاع ) لاسەنگ دەبوو ، دەنگێکی زوڵاڵ کە موکەبەرەکان ئەوەندەی تریان قەبە دەکرد، لەگەڵ چەندەنگێکی کزوبێ هێزدا ـ هەرچەندە دەنگ لە ئەکتەرێکەوە بۆ ئەکتەرێکی تر دەگۆڕرا(11) .. ئەوانی تر ناچار لە هەندێ جاردا ، وەك ووتار خوێندنەوە دەنگیان لێ بەرز بکەنەوە . جارێکیان رەفیق چالاك لە شانۆیی پیسکەدا میکرۆفۆنەکەی لە دەرەڵنگی پانتۆڵەکەیەوە بردبووە سەر سنگی ، لەکاتی قسەکردندا ، بۆ وایەرەکە هەندێ لای ڕووت بووەو کارەبای دزیبوو ، تەزووی کارەبای پیا دێو ئەیگرێ ، جا بۆ ئەوەی لای بینەران کارەکە ئاشکرا نەبێو(نووری بەدەوی) کە سەرپەرشتی ئیمپلیفایەرەکەی

دەکرد ، ئاگادار بکات ، دەیوت : ( موئامەرەم لێ ئەکەن ، ئەتانەوێ بەکارەبا بم کوژن ! ) ، بەڵام کاك بەدەوی بە ماوەیەکی درەنگ تێگەیشت کارەبا تەزووی بە رەفیق چالاکدا دەهێنێت(12) .

**لەو کاتەدا لای ئەکتەرەکان موبالەغەکردن لە دەوردا یاو بوو ، زۆر جار ئەو موبالەغە کردنە ، وای لە هەندێ ئەکتەر دەکرد خۆی لەبیر بچێتەوەو لە دەورەکەی بچێتە دەرەوە ، ئەمەش کارێکی خراپی دەکردە سەر ئەکتەرەکانی تر کە دوا ڕستەی دایەلۆژی ئەکتەرەکەی هاوەڵی لەبەر کردبوو ، وای لێ دەکردن تابلۆکە بشێوێت ، تا مولەقن فریا دەکەوتو دەی هێنانەوە سەر ڕەوت . چالاك لەو لایەنەدا چاپووك بوو ، هەرچەندە دەوری کەم لەبەر دەکرد ، لەبەر ئەوە هیوای زۆر بە مولەقن بوو(13) ..**

لە سەرەتای کارکردنی کۆمەڵدا ، ئافرەت نە دەهاتە سەرشانۆ ! ، چونکە بە کارێکی ناپەسەند دەدرایە قەڵەم ، کوڕ دەوری ئافرەتی دەبینی !.. هەندێ جار کارەساڵی سەیر لە کاتی دەورەکاندا ڕووی دەدا ، جارێکیان یەکێ لە مەمکی ئەکتەرەکان کەوتە خوارەوە !. (14) .. یان هەندێ جار سەرو پێچ دەکرایەوە ، ئەوسا پێرووك بەکار نەدەهات، بەڵکو قژی درێژ بەهۆی لاستیك ، یان پەتەوە بەقژەوە بەند دەکرا ، کڵاوو سەرو پێچی دەکرا بەسەرا ! (15) .. زۆربەی ئیشو کاری ئارایشت کەران بەوانەوە خەریك دەبوون کە دەوری ئافرەتییان دەبینی ، ناو بەناویش بۆ گاڵتەو گەپ سوعبەتی خۆش خۆشیان لەگەڵدا دەکردن .. لەوانەی دەستی باڵایان لە ئارایشت کردندا هەبوو مامۆستایان : ( ئازاد شەوقی ، سەعید ، بورهان مەسرەف ) بوون . لە سەردەمی کۆمەڵدا لایەنی ئارایشت گەلێك پێشکەوتنی بەدەست هێنا(16)

ساڵانی 956 – 957 بە لوتکەی جمو جوولیەی کۆمەڵ دەژمێررێت ، لەبەشی یەکەمی ساڵی (1957 )ەوە ، کۆمەڵی هونەرە جوانەکان بە هۆی بارو زرووفی سیاسی ئەوسای عیراقەوە بەرەو کزی دەڕۆیشت .. لە ساڵی ( 1957 )دا کۆمەڵ لە شوێنەکەی پێشووی گوێزرایەوە . بۆ ئەم مەبەستەش خانوویەکی ئەهلی بۆ بەکرێ گیرا(17) .. لەو ماوەیەدا دەستەی بەڕێوەبەر گۆڕرا (18) ، ئەوەی شایانی باسە لەو سەردەمەدا بەرەی نیشتمانی دەوری باڵای دەبینی ، ئەوەی من ئاگاداری بووبم ، هەندێ کارو باری بەرە لەکۆمەڵدا بەڕێوە دەبرا ، هەر یەکە لە لایەنەکان بەرە ، نوێنەریان لە دەستەی بەڕێوەبەری کۆمەڵدا هەبوو .

لەو کاتەدا کە کۆمەڵ لەو خانووەدا بوو ، دوو شانۆیی ئامادەکرا ، یەکەمیان ( پیسکەی تەڕپیر ) بوو ، ئەوی تریان ( تاوانو تۆڵە ) بوو(19) .. هەردوو شانۆیەکە برا بۆ هەڵەبجەو لەسەر شانۆی سانەوی هەڵەبجە پێشکەش کران(20) . پاش ئەوەی لە هەڵەبجە هەموو شتێ سازکراو جاڕ بڵاوکرایەوە .. لە کاتی چاوەڕوان کردنی خەڵکیدا ، سەیر دەکەین تاك و تەرا نەبێت کەس نایەت بۆ بینینیان ، هەموو سەرسام بووین !.. هۆی چی بێت خەڵکی نایەن ؟! .. تۆ بڵێی نەیان زانیبێت ؟! .. نەخێر ! .. پڕوپاگاندەیەکی باش کرابوو .. ئەو ئێوارەیە هیچی وا حاڵی نەبووین .. بۆ سبەینێ ...ەکە زۆر ئالۆز بوو ! .. بەیاننامەی سیاسی بڵاوکراوەتەوەو ... خەڵکی کراوە نەچن بۆ بینینی ئەو شانۆیانە ... ناوی ( .... ) هۆی سەرەکی بوو ، هەرچەندە ... هەمان بەرە جێگری سەرۆکی کۆمەڵ بوو ، لە هەڵەبجە لە گەڵماندا بوو .. پاش ئەوەی زۆر شت ڕوون کرایەوە، کارەکە پێچەوانە بووەوە ، وای لێ هات هۆڵەکە یەکێکی تری نەدەگرت! .. لەبەر دەرگا لەسەر بلیت برین دەمە قالیەکی دوورو درێژ بوو .. سێ شەو شانۆیەکان پێشکەش کران ، لە شەوی چوارەمدا هەواڵی لافاوەکەی سلێمانیمان پێ گەیشت ، دەست بەجێ گەڕاینەوە بۆ سلێمانی ، هەرچەندە خەڵکی بە پەرۆشەوە داواکاریی ئەوە بوون بەردەوام بین .. کارەساتی لافاو کارێکی خراپی بە شاری سلێمانی کردبوو ، زۆر کەس لەناو چوونو زۆر شوێنو خانو بەرە زیانی پێ گەیشتبوو ، یا لەو شوێنانە بارەگای کۆمەڵ بوو .. ئەو کارەساتە وای کۆمەڵ کرد بیر لەوە بکاتەوە هاوبەشی لە باربووی لێ کەوتووانا بکات . هەر دەست بەجێو زۆر بە گورجی شانۆیی ( لەڕێی نیشتمان ) دا بۆ سەرشانۆ ئامادە کراو دەورەکان دابەش کرانو دەست بە پرۆڤە کرا . هەروەکو لە دوو توێی یادما مابێت ئامادەکردنو پرۆڤەو دیکۆرو بلیت ئامادەکردن ، سێ هەفتەی نەخایاند .. ئوتومبێلی پڕوپاگاندەکەی ئیدارەی محەلی بۆ پڕوپاگەندەی شانۆیەکە مەرگیرا ، رەفیق چالاك خۆی پڕوپاگەندەکەی بڵاو دەکردەوە ، لەگەڵ خۆیدا چەند ئەکتەرێکی خستبووە ناو ئوتومبێلەکەوە ، هەریەکە لەو ئەکتەرانە چەند دایەلۆژێکی شانۆیەکەیان دەخوێندەوە ، بە بۆنەی لافاوەکەشەوە کاك ( نووری وەشتی ) هۆنراوەیەکی دوورو درێژو کاریگەری دانابوو ، چالاك ئەوەشی دەخوێندەوە، خەڵکی بە پەرۆشەوە گوێیان بۆ شل دەکردو دەورێکی باڵای بینی بۆ قەڵە باڵغ کردنی شانۆیەکە . جگە لەو بلیتانەی لە هەموو کتێبخانەو دووکانە بەناوبانگەکان دەفرۆشران ، بلیتی تایبەتی بۆ دەوڵەمەندەکانی شار چاپ کرابوون ، هەر یەکە لە بلیتەکان خرابوونە زەرفەوەو ناوی ئەو دەوڵەمەندانەی لەسەر نوسرابوو ، ئەندامانیش بۆیان دەبردن ، هەریەکە ئەو پارەیەی دەیدا لە پشتی زەرفەکەی ئەنووسیو ئیمزای دەکرد،

خوا هەڵناگرێ هەندێکیان پارەی باشیان دەدا !.. بەڵام ئەوانەی لەو کاتەدا زۆر دەوڵەمەند بوون هیچی وایان لەدەست نەدەبووەوە . بۆ نموونە یەکێ لەوانە ( سێ پەنجایی )ی دابوو(21) ..

ئەو شانۆیە . لە نووسینی ( فرانسوا کۆبیە )یە . رەفیق چالاك بە هاوبەشی کاك نووری وەشتی ئامادەیان کردبوو . لە راستیدا شانۆیەکە زۆر سەرکەوتوو بوو . ماوەیەکی زۆریش بەردەوام بوو . نزیکەی هەزارو دووسەد دینار کۆکرایەوە(22).

**لە کۆتایی ساڵی ( 1957 )دا کۆمەڵ لقێکی لە شاری هەڵەبجە کردەوە(23) ..**

لە ساڵی ( 1958 )دا کۆمەڵ گوێزرایەوە بۆ شوێنی موختەبەرەکەی ئێستا کە دەکەوێتە خوار خەستەخانەی کتەو پڕی‌یەوە .. ئەو شوێنە زۆر لەبار بوو بۆ کۆمەڵ . دەست کرا بە دروست کردنی شانۆیەکی خنجیلانە لە هۆڵەکەیدا . ژووری نیگارکێشانو مۆسیقا جیا کرایەوە(24) .. لەو ساڵەدا ( عبدالمطلب امین ) موتەصەریفی سلێمانی بوو . زۆر حەزی بە هونەر دەکرد . کرا بە سەرۆکی فەخریی کۆمەڵ . هەموو رۆژانێکی دووشەممە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لە ماڵی موتەصەریف ساز دەکراو باسی هونەرو کاروباری کۆمەڵ دەکرا. وا رێك کەوت دوا کۆبوونەوە بکەوێتە رۆژی دووشەممە کە رێکەوتی چواردەی تەمووزی ساڵی (1958) کۆبوونەوەکە نەکرا ..

دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی پیرۆزو بە هۆی بەرپا بوونی باری تازەوە. چەند گۆڕانکارییەك لە کۆمەڵدا بەرپا بوو. دەستەی بەڕێوەبەر گۆڕرا(25) .. پاش ماوەیەك ناکۆکیو دووبەرەڵی کەوتە کۆمەڵەوە . هەر لایەنێك دەیویست بەلای خۆیدا ڕای کێشێ کە بەداخەوە گەر وا نەبوایە.کۆمەڵ دەیتوانی دەوری لەبارو کاریگەر ببینێ . کۆمەڵ ڕۆژ دوای ڕۆژ بەرەوکزیو لاوازی دەڕۆیشتو نەیتوانی هیچ دەورێك ببینێ .. دوا هەڵبژاردن . لە کاتێکا بەرەو کۆمەڵ دەچووین بۆ دەنگ دان . لە ڕێکا هی‌وا لێی دەپرسین کۆمەڵ لە کوێوەیە ، دەربارەی هونەر هیچیان نەدەزانی بگرە لەوانەش بوون ناوی کۆمەڵیان بۆ یەکەم جار بیستبێ! .. هەموو لە ژێرەوە کرابوون بە ئەندام!! ..

دوای ئەوەی دەنگیان داو کاریان بە ئەنجام گەیاند ڕوویان نەبینرایەوە. تا ئێستاش نەك لە کارێکی هونەریدا. بەڵکو لە هامشۆی هیچ کارێکی هونەریدا نەبینراون! ..

بەو شێوەیە کۆمەڵ تا ڕووداوی 1961 لە کوردستانا،مایەوە کە لە لایەن میریەوە داخراو هەموو تۆمارەکانی پێچرایەوە ..

## پەراوێزەکان

1 ـ تیپی مۆسیقای مەونەوی . بەر لە پێكهێنانی کۆمەڵی هونەرە جوانەکان دامەزرابوو.هەرچەندە ئەم تیپە بە شێوەیەکی رەسمی مۆڵەتی کارکردنی پێ نەدرابوو ، بەڵام ئەم تیپە نازدارە توانی بوونی خۆی بسەلمێنێو سەربەست کاری خۆی بکات .. تیپەکەش لەم هونەرمەندانە پێك هاتبوو : ( قادر دیلان ، ولیم یوحەنا . بەهجەتی رەشیدی سەعاتچی ، نەجاتی عەبدە . حاتەم سەعید . جەلال عزیز رسول ، هادی عەنبەر ، نووری بەدەوی، قادر کوردی ) ..

2 ـ ناوی تەواوی کۆمەڵ ( کۆمەڵی هونەرە جوانەکان ـ مەڵبەندی گشتی ) بوو ، بەپێی پەیڕەوی ناوخۆ کۆمەڵ بۆی هەبوو لە ناوچەکانی تری کوردستاندا لق بکاتەوە .

3 ـ سەرەتای سروودەکە بەم جۆرە دەست پێ دەکات :

**ئەوا هەلکرا مەشخەڵی هونەر**
**تاوەکو بۆ گەل ببێتە رابەر**
**دەسا ئەی براو خوشکی تێکۆشەر**
**وەرنە کۆڕەوەو ڕێ بگرنە بەر**

4 ـ رەفیق چالاك لە دەوری میرزا مەحموودا .. نووری وەشتی لە دەوری سالاردا ، طه خلیل لە دەوری باجی ئایشێدا، صەلاحی حمە جمیل لە دەوری پرشنگدا ، کەمالی رەشیدی مختار لە دەوری گەلاوێژدا ، یاسین خلیل حسین لە دەوری دلشاددا ، برهان مصرف لە دەوری نەبەردا ، شێرکۆ بێکەس لە دەوری صدیق بەگدا ، عەبدوڵای بەنا لە دەوری مچەدا .. بە داخەوە ناوەکانی ترم لەیاد نەماوە .. ئەوەی شایانی باسە لە جاری سێیەمدا کاك سمکۆ عزیز شانۆیەکەی دەرهێنابوو کە ئەوسا قوتابیی بەیمانگای هونەرە جوانەکان بوو .

5 ـ لەم شانۆیەدا بوو رەفیق چالاك (خاڵەی رێبوارەکەی) تێدا دەوت ، انور أحمد دەوری لەیلی دەبینی ، لەم شانۆیەدا ئەم هونەرمەندانە دەوریان تێدا دەبینی :

**رەفیق چالاك لە دەوری کوردا**
**نووری وەشتی لە دەوری باوکدا**
**طه خلیل لە دەوری پیاوی احمد بەگدا**

بۆ ئەم شانۆیە دیکۆرێکی موجەسەم دروست کرا بوو ،

له تابلۆی مردنەکەدا لەسەر شانۆ دانرا بوو .

6 ـ ئەم جارەیان بە بۆنەی جەژنەوە پێشکەش کرا ، ئەم شانۆییە ڕۆژی دوو کەڕەت پێشکەش دەکرا ، سەر لە بەیانیو ئێواران ئەم جارەیان کاوەی ئەحمەد میرزا دەوری گەلاوێژی دەبینیو فەرەج ئەحمەد دەوری صدیق بەگی دەبینی .

7 ـ لەو سەردەمەدا ئەو بۆیاخەی پێی دەڵێن ( ئەمەلشن ) نەبوو ، بەڵکو بۆیەی ( ئیستەمپەر ) هەبوو کە تۆز بوو، دەخرایە ناکەتەوە ، سەتڵی گەورە ئامادە دەکرا ، ئاوی گەرمو سرێشی خۆماڵی ـ کە ئەویش هەر تۆز بوو ـ تێی دەکرا ، پاش ئەوەی بۆیەکەی تێ دەکرا ، بەدار تێك دەدراو بە فڵچە هەموو پەردە گەورەکە بۆیە دەکرا ، پاش ووشك بوونەوە ، نیگارەکەی لەسەر دەکێشرا، زۆر جار کە ناچار دەبووین لەبەر ڕاپەڕاندنی کاروبار، شەو لە کۆمەڵ بمێنینەوە ، ئەو پەردانەمان دەدا بە خۆماندا ، بەیانی کە هەڵ دەساین هەموو لەشمان بۆیە بوو ، ئەمە جگە لەوەی دەمو چاوو لەشمان هەموو کەتیراوی دەبوو . ئەوەی شایانی باس بێت کاك شیرزاد شـــوقی لە دیکۆری پیسکەدا هەڵوبەشی چاکی هەبوو .

8 ـ ئەم دیکۆرە مامۆستایان ئازاد شەوقیو خالد سەعید دوو ستیان کرد .

9 ـ ئەو هونەرمەندانەی شانۆییەکانیان دەر هێنا ( ڕەفیق چالاك ، ئەنوەر توو فی ، سمکۆ عزیز ) بوون .

10 ـ هەر ڕۆژێکی پێشکەش کردنی شانۆییەکان ، بۆ چین ، یان دەستەیەکی تایبەتی تەرخان کرابوو ، ڕۆژێ بـۆ پیاوان ، ڕۆژێ بۆ ژنان ، یان بەم جۆرە ، خشتەیەك بـــڵاو دەکرایەوە ( هەموو ڕۆژێکی هەفتە دابەش دەکرا بۆ : ئەهالی ، فەرمانبەران ، قوتابیان ، ژنان ، ئەشراف !! ) .

11 ـ هۆڵەکەی سانەوی تا ئێستاش هەر دەنگ دەداتەوە، ئەمە جگە لەوەی سەقفی سەر شانۆکە ئـەمەندە ناڵەبارو بێ کەلکە ، دەنگەکان قووت دەداتەوە ، ئەمەش دەورێــکی باش دەبینێ لەوەی تەنها یەك دوو ڕیزی ناو هۆڵەکە زیاتر بە باشـی دەنگ نەدەبیسترا ، بەڵام لە گەلەریەکەوە بـە باشـــی دەنگ دەبیـسترا ، لە شەوی ژناندا کاتێ ئەو ئەکتەرانـــەی دەوری ئافرەتیان دەبینی ، قسەیان دەکرد ، ژنانی ناو هۆڵەکـــە وورتەیان لێوە نەدەهات ، هەر بۆ ئەوەی بزانن بە باشـــی لاسایی ئافرەت دەکاتەوە یان نا ؟ . زۆر جاریش لـــە جلو بەرگو شێوەی لەبەرکردنەکەی وورد دەبوونەوە ئینجا یـان سەری ڕەزامەندیان دەلەقاند ، یان پێکەنین بەرپا دەبوو ! ..

12 ـ کارەبای ئەو سەردەمە ( دیـسی ) بوو ، ئەو هێــزو تینەی کارەبای ئێستای نەبوو ، ئەمە جگە لەوەی وایەرەکە کەمێ ڕووت بوو ، تووەز کارەبا لە لایەکی ترەوە چۆتە نـــاو خـەتی میکرۆفۆنەکەوەو ئەو تەزوانە دەگەیەنێت .

13ـ مولەقن شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو ، کە چاڵێك بوو لە پێشەوەی شانۆکەدا ، چادرێکی وەك چەتری دووکانەکانی بۆ کرابوو ، مولەقن دەقی شانۆییەکەی دەگرت بە دەستەوەو دێر بە دێری شانۆییەکەی لەگەڵ ئەکتەرەکاندا چاودێری دەکرد ، ئەگەر ئەکتەرێك دەورەکەی لەیاد بچوایە ، دەست بەجێ پێی دەوتەوە ، زۆر جار دەنگی مولەقن دەگـــەیشتە ناو هۆڵەکە ، بەڵام چار نەبوو ، گەر وا نەبوایە شیرازە دەپچڕا .

14 ـ مەمکی دەست کرد کە بە ئەسفەنجی تورت دروست کرابوو ، لە دەرەوەی عیراق دەهێنرا ، نازانم چۆن گەیشتبووە سلێمانی ! .. ناوەکەی بۆش بوو ، ئەکتەرەکە بەهۆی سوخمەی تایبەتیەوە بە سنگیەوە ڕای دەگرت ، یان جاری وا هەبوو ناوی سوخمەکە بە پەڕۆ دەئا خنرا !..

15 ـ لەو ئەکتەرانەی لەو سەردەمەدا بـە باشی دەوری ئافرەتیان دەبینی ( صەلاحی حمە جمیل ، انور احمد ، کـەمال مختار ، طە خەلیلیش لە دەوری پیرێژندا کەس نـەی دەتوانی شانبدا لە شانی ! ) .. یەك دوو جاریش خۆم دەوری ئافرەتم بینیوە ..

16 ـ ڕیشو سمێڵ بە خوریو مووی بزن کـە بە هۆی ئەسیتۆنو بنێشتە تاڵەوە دەنوسێنرا بە دەمو چـــاوی ئەکتەرەکانەوە.لە پێشترا دەرمانی بەنچەری بەکار دەهێنرا!.. کە دەمو چاوی دەسووتانو سوێی دەکردە دڵەوە ! .. یان تەپە دۆر دەسووتێنراو ڕیشو سمێڵی پێ دەکرا .

17 ـ ئەو خانووەش دەکەوێتە پشـــــت مزگەوتەکەی تەبیشت ئەجزاخانەی شەوکەتەوە .

18 ـ ئەم برایانە ئەندامی دەستەی بـــەڕێوەبەر بوون : ( ڕەفیق چالاك ، نووری وەشتی ، فەرەج ئەحمەد ، صـەلاحی حمە جمیل ، سعید فرج، قادری حاجی تایەر ، طە خلیل ، جەمال بەختیار ) .

بەداخەوە لەو سەردەمەدا پرۆگرام نەبوو ناوی شانۆیو نووسەرو دەرهێنەرو ئەکتەرەکانو هونەردارانی تیا بنوسرێت، کە بێ گومان گەر وا نەبوایە، ئێستا وەك بەلگەیەکی باوەڕ پێ کراو دەبووە سەر مەشقی نووسینو کەلکی زۆری لێ وەردەگیرا . ئەوسا وا باو بوو ، یەکێ لە میکرۆفۆنەکەوە ناوی شـــانۆییو نووسەرو دەرهێنەرو ئەکتەرو دەورەکانیـــانی دەخوێندەوە ، ئەکتەرەکانیش یەك بە دوای یەکا دەهاتنە سەر شانۆو هەر یەکە

دایەلۆژێکی دەورەکەی خۆی دەوتو سلاوێکی بۆ بینــەران دەکردو دەرۆیشت .

20 ــ لە شانۆیی ( پیسکەی تەرپیر )دا کە برا بۆ هەڵەبجە زۆر لە ئەکتەرو دەورەکانیان گۆڕرابوون ، بۆ نموونە :

**کاوەی ئەحمەد میرزا لە دەوری پرشنگدا**

**رؤوف ماستاو لە دەوری صدیق بەگدا**

**نەوزادی صالح رەفعەت لە خزمەتچیدا**

**بەکر اسماعیل لە خزمەتچیدا**

**اسماعیل بەرزنجی لە معاوندا**

شانۆیی ( تاوانو تۆڵە ) ئەم ئەکتەرانە دەوریان تیا بینیوە :

**رؤوف ماستاو لە دەوری باوکدا**

**کاوەی ئەحمەد میرزا لە دەوری کچدا**

**عزیزی حاجی صالح لە باوەژندا**

**نووری وەشتی لە کوڕدا**

لەم شانۆییەدا ، کاتێ باوکەکە خەنجەرەکە دا دەوەشێنێ بۆ کچەکەی کە بەدەستی باوەژنەکەی تاوانو تۆمەتی خراوەتــە پاڵ بە مەبەستی کوشتنی، خەنجەر وەشاندنە کە ئەمەندە ڕێکو پێك بوو ، هەرچی لە هۆڵەکەدا هەبوو هەســـتانە سەرپێو هەندێکیان ڕوویان کردە سەر شانۆکە .

21 ــ یەکەم شەوی پێشکەش کردن ، بــەر لــەوەی شانۆییەکە دەست پێ بکات ، رەفیق چالاك لەبەردەم پەردەوە، ناوەکانی دەخوێندەوە ، بە تەوسەوە باسی ئەوانەی دەکرد پارەی کەمیان دابوو ــ پارەکەش بۆ باربووی لێ قەوماوان بوو ــ لە کاتی ناو خوێندنەوەدا ، کە گەیشتە سەر ناوی کرێکارێك کـە دینارێکی دابوو ، زۆر بەرێزەوە ناوی هێناو ووتی : (فلان کەس کە کرێکارەو بەرەنجی شانو ئارەقی ناو چەوان پارە پەیــــدا ئەکات ، یەك دینار .. یەعنی بیست پەنجایی .. فـــــلان کەسیش ٠ .. کە عەبا بەشانو ئەشرافو دەولەمەندی شارە ، دوو روپیە .. سەدو پەنجا فلس .. یەعنی سێ پەنجایی ! ) . هەروەها ووتی : ( هەموو شەوێ ئەو ناوانە ئەخوێنینەوە ! ) بۆ کابرا ئەمەی نەبیستبووەوە ، دەست بەجێ پێنـــج دیناری ناردبوو ! ..

22 ــ رەفیق چالاك خۆی شانۆییەکەی دەرهێنابوو ، ئەم برایانە لەو شانۆییەدا دەوریان دەبینی :

**رەفیق چالاك : لە دەوری سەرکردەدا**

**نووری وەشتی : لە دەوری کوڕی سەرکردەدا**

**دلشاد مەسرەف : لە دەوری خەفیەدا**

**طە خلیل : لە ژنی سەرکردەدا**

**صەلاحی حمە جمیل : لە کچی سەرکردەدا**

**مەکی عبداللە : لە قەشەدا**

ئەوەی شایانی باسە ، هەمان شانۆیی لە ساڵی (1959)دا لەلایەن ( تیپی نواندنی شۆڕش ) کە سەر بە لاوانی دیموکراتی عیراق بوو ، لەسەر شانۆی لاوان ( کتێبخانەی گشتیی ئــەو سەردەمە ) کە ئێستا پەروەردەی سلێمانیە ، پێشکەش کرا ، ئەم خوشکو برایانە دەوریان تیا دەبینی :

**کاوەی ئەحمەد میرزا : سەرکردە**

**طە خلیل : کوڕی سەرکردە**

**درخشان شەریف : ژنی سەرکردە**

**ملیحە رشید : کچی سەرکردە**

**هێرۆ گۆران : کارەکەر**

**عبداللە مجید : خەفیە**

**رؤوف ماستاو : قەشە**

**کمال رشید مختار : ئەفسەر**

لەگەڵ چەند براو خوشکێکی تردا ، بەداخەوە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە .

23 ــ مامۆستا عەلی شەونم لە کردنەوەی لقی هەڵەبجەدا دەوری بالای هەبوو ، لە گەڕەکی ( کانی قوڵکە ) بارەگای بۆ گیرا، لە ئەنجامی هەڵبژاردندا مامۆستا ( فؤاد عزت ) بووە سەرۆکی کۆمەڵ ، ئەو لقەی کۆمەڵ چەند بەرهەمێکی شانۆیی باشیان لە هەڵەبجە پێشکەش کرد .

24ــ لەو ساڵەدا چەند پیشانگایەك کرایەوە ، مامۆستایان: ئازاد شەوقی ، خالد سەعید ، عثمان خال ، جەمال بەختیار ، دەوری بالایان تێدا هەبوو ، صەلاحی حمــە جــەمیلیش پیشانگایەکی تەخطیطی لە بارەگای کۆمەڵدا کردەوە .

25 ــ مامۆستا گۆران بووە سەرۆکی کۆمەڵ ، ئــــــەم برایانەش بوونە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەر ( جەمال شاڵی ، شێخ شــەهاب ، ســەلاحی حمــە جمیل ، طــــە خایـل، نووری وەشتی ، کمال مختار ، کاوەی ئەحمەد میرزا ) .

**تێبینی : ئەم ووتارە لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکدا بە ناونیشانی ( ئەو قۆناغانەی شانۆی کوردی بڕیوێتی ) لە کۆڕێکی نەقابەی هونەرمەندانی سلێمانی لە چوار چێوەی وەرزی رۆشــنبیری دووەمدا خوێنرایەوە .**

فۆلكلۆر

نورالدين سعيد
● زاخو ●

حەیرانۆك

# قولنگۆ

قولنگۆ قولنگێ سیرتێ[2]
ئەڤە سێ شەڤان و سێ رۆژانە
... میراتا رێ تێ[3]
چاوا سەبرێ دەلالێ من ...
ل وولاتێ غەریبیاتێ

● ● ●

هەرێ قولنگۆ تو خەلەتی
بەرێ تە ل رۆژانا بهشتاتە ل سللەتێ
هەچی کەسێ ل رۆژانێ ئێدی هاتوو
وا ل من عەفدالا خودێ بێ خافلەتی

● ● ●

قولنگۆ تو نە کوچەرێ تو نە ئێرسی
خوێسارا مالك خراب ل سەر ...

چەنگێ تەڤەرسی
هەچی کەسکێ ژ رۆژانی ئێدی ...
هاتو من عەفدالا خودێ ژێ پرسی ،

● ● ●

ئیڤاریە رۆژ چوو ئاڤا
بوشی[4] یەتە کاڵنیا ل دەرێ خانیکێ ...
مالا بابێ من گرتی قوژەل و چەما من گوتێ وێت هە کینە گوت .
... خوازکینێت بە ژنا بلندی ... روحکا ...
شرین سەر قالبێ ئەما

● ● ●

... سوورا بەفرکێ مشتەو[5] ...
ژ حەواکێ هیرانێ چەندک کاره
گریکێ من عەفدالا خودێ تێت
ژ کولێ و کوڤانێ دلێ مەرە

---

١ ـ ئەڤە من ژ ژنەکێ وەرگرت ژیێ وێ (٨٠) سالا پترە خەلکێ بالایێرێ زاخۆیە ناڤێ وێ (کوڤانی سیف‌الدین) ە .
٢ ـ سیرت : بالاژیرەکە دکەڤت کوردستانا ترکیا .
٣ ـ تێ : کورت کرنا (تێت) ە .
٤ ـ بوشی : کومەکا مەژنە .
٥ ـ مشتە : پرە ، تژی‌یە .
٦ ـ رمکەك : ئالەك ، لایەك .

# پەندی کوردی

عومەر شێخەڵا دەشتەکی

**١ ـ یەك لەسەر گەورەکان نەمایە ! .**

ڕێـوی‌یەك‌و هـرسێك دەبنـە بـرادەر ، مـاوەیـەکی .. پێ‌دەچێ :

**هرسەکە** : هاوڕێ‌ی خـۆشەویستم من‌و تـۆ مردن‌و ژیـانمان یەکە .

**ڕێوی** : تۆ ئەوە چ دەڵێ‌ی من‌و تۆ تاکە گیـانێکین لەنـاو دوو لاشەدا .

**هرسەکە** : کە ئێمە ئەوەندە تێکەڵاویمان بەهێز بێ وای بەباش دەزانم ، بێچوەکانمان تێ‌کەڵ بەیەکتری بکەین ، کۆزی من‌و تۆ هەریەکە ، تۆ لەماڵەوە بمینێوە ئاگاداری چاکەو خراپـەکی بکە ، منیش لەتۆ بە تواناترم بۆی دەردەچم ئەوی خودا دای دەی‌هێنمەوە پێکەوە بەخاوخێزانەوە دەی‌خۆین .

**ڕێوی** : زۆر باشە ، پێویستە ئەوەندە پەیوەستی دنیا نـەبین هەمووی پێنجو دوو ڕۆژێکە دەبڕێتەوە کۆتایی بەژیانمان دێت ، بائەوەندەی ماوە بەخۆشی‌و تێ‌کەڵاوی ببەینەسەر .

**هرسەکە** : بەڵێ بەراستی تۆ برایەکی باش‌و زیرەکی .

**ڕێوی** : برا گەورە چ بڵێ پێ‌ویستە برا گچکە لەگوێ‌و هەمدی دابێ‌و پەیڕەوی ئامۆژگاری‌یەکانی بکات . هـرسەکـە لێ‌ی‌دا ڕۆیشت هەردەو چۆڵی گـرتە بـەر بەدوای ئـەوەی دەرامەتی لەسەر بێ‌یانە .

مام ڕێوی لە ماڵەوە مایەوە بەدیار گەردیل‌و وەردیلەکان بـووە ئێشك‌گر ... جغارە خۆرێك‌و دووان برسێتی کـاری لێ‌کرد ... چاوی گێڕا چ نەبوو ، قـرقرا تـەق ئارەزووی چـووە گۆشتی ناسکی یەك لەبێچوە هرسە سەرگەورەکان تی‌لایەکی کردەوە قیرەبڕی کرد ، تا تێرو پڕی لێ‌خوارد چوو بـەداماوی لەدیـار بێچووەکان وەرکەوت ، چاوەنواڕی گەڕانـەوەی هرسـەکەی دەکرد ، دوورو نزیك کەم‌و زۆر هرسەکە بەدیار کەوت .

**ڕێوی** : بەچاوی بەگریان‌و پڕ لە فرمێسك بەپیری‌وە چوو ..

**هرسەکە** : ها خێرە کاکە چ‌بووە زوو پێم‌بڵێ ؟

**ڕێوی** : چ‌نەبووە یەك لە بێچووە سەرگەورەکانمان نەماوە .

**هرسەکە** : هی‌منە یا هی‌تۆیە ؟ !

**ڕێوی** : هاوڕێ چەند بەهوردو باریکانی ئەو جیاوازی‌یە چیە ؟ جـەرگ سووتـا چ هی‌من چ هی تۆ جیـاوازی چیە ؟ ! یـەك لەسەرگەورەکان نەماوە .

هـەفتەکـو دووان ڕێوی لەدەرفـەتـانـدا بـەردەوامی پیشـە خراپەکەی خۆی دەبوو .

**هرسەکە** : دلی لێ کرمێ‌کرد . دووا جار گوتی ئەم جارە لەسەر گەورەکانە یان لەسەر گچکەکانە ؟

**ڕێوی** : دۆستی بەڕێزو دێرینم جەرگ سووتـا سەر گـەورەو گچکەی نازانی .

**هـرسـە** : خـێر دەبێ ئـەو گـرێ‌ی دڵم لابـەری ڕاستیم بـۆ ڕوون‌بکەیتەوە .

**ڕێوی** : ئەمە کارێکی زۆر ئاسانە ئەم شەو دەخەوین کاممان زۆری خواردبێ خۆی پێ‌ڕاناگیرێ دیارە سووچی وی‌یە .

**هرسەکە** : قسەت زۆر تەواوە ، قسەی پیاو ماقوولانە ... ؟ ئێوارە داهات هرسەکە لەماندوو بونیان زوو پەکی کەوت خەوی لێ‌کەوت !

ڕێویش زۆری خواردبوو قرقرا خۆی پێ‌ڕانەگیرا ناچار خۆی گەیاندە هرسەکە مەشکەی بەتـاڵ‌کرد ، بـەیانی ڕاست بوونەوە دیتیان هرس خۆی پیس کردوە .

**هرسە** : ئەوە چیە ؟ بۆ وام بەسەرهاتوە ؟

**ڕێـوی** : لەخـۆت بپـرسـە ، خـۆت دەزانی چیت‌کـردوە ! بـرادەرایەتی وا دەبێ جـەرگمت بە تـەندووری وەدا ، پیـاو خراپیشت کردم خواو ڕاستان ڕاستی بەدیار کەوت ، هاوڕێ ئەگەر لات گران نەبێ من ماڵی خۆت لەگەڵ دەکەم خۆکەس دوو برایان لەگۆڕەکی نەنایە ! . من تازە چیتر ئەم ژیانەم لاپەسند نی‌یە خوات لەگەڵ .

ئەم پەندە بەکـەسێکی پیشەخـراپی تەڵەکـەباز دەڵێن تووشی ساویلکەکی ببێ خراپەی لەگەڵ بکات‌و ئەویش پیاوخراپ بکات .

**٢ ـ بـەتەوەجـووهـەکی هـەمـووم لێ‌خـڕبـوونـەوە ، بەبلیەکی هەمووم لێ‌ڕموینەوە .**

دەڵێن شێخێـك شـارەکـەی خـۆی بـەجێ‌دێـڵێ دێتــە شـارێکی‌دی باوەڕی شێخـایەتی بـڵاودەکاتـەوەو خەڵکـەکە لەدەوری کۆدەبنەوە .

شێخ بو ئەزموونی مریدەکـانی یەك دووجـار ئەو بـای لەزکی‌دا نای‌گێڕێتەوە ، دەروێشەکان بەتـەواوی گوێ‌بیست دەبن چبوو چبوو لەنێویان پەیدا دەبێ وارە ... وارە خەڵکەکە لێ‌ی‌سـارد دەبنــەوە ، پشتی تێ‌دەکـەن ئـەو کـاتـە دەڵێ بەتەوەجوهەکی هەمووم لێ‌خڕبوونەوە ....

ئەم پەندە کەسێکی زۆ زیرەك بەکۆمەڵە کـەسێکی کەم زانی گەلۆ دەڵێن دوای چاولێ‌کەری کەوتبن .

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

•

## لە هەولێر

شوان : ئامادەی کردوە

### ● دوو شاعیرو کۆڕێك ●

لە سەرەتای ساڵی 1970 وە بۆ جارێکی تر گۆمە مەنگەکەی دونیای ئەدەبو رۆشنبیری کوردی شڵەقێرا ؛ ئەو بانگەوازەی لە لایەن ئەدیبان حسین عارفو ، شێرکۆ بێکەسو دەستە برادەرەکانیانەوە بانگی بۆ هەڵدرا رۆڵێکی گرنگو کارێکی بەهێزو کاریگەری کردە سەر گەشەکردنو بەرەو پێش بردنی ئەدەبی کوردیو بەرگی سستو خەماوی لەبەر داماڵیو چەندین لاوی خوێن گەرمو شەیدای پاکێتیو عاشقی وشەی پیرۆزی کوردی رووەو کاروانی ئەدەبی نوێخوازی کوردی چوونو تێشوبەرەی ورەو بەردەوامیو کارکردنیان لەپشت بەست . ئەوەتا ئێستاش ئاکامو رەنجی ئەو تەقەلایە ئەدروینەوە

رۆژی 16 / 2 / 1983 لە وەرزی یەکەمی رۆشنبیری جەماوەر لە هەولێر کۆڕێکی ئەدەبی بۆ هەردوو شاعیر ، عەبدوڵلا عەباسو صلاح شوان ، سازکراو جگە لە ئەدیبو رۆشنبیران کۆمەڵێکی زۆر لە قوتابیانی کوڕو کچی زانکۆی ، صلاح الدین ، ئامادە بوون ..

سەرەتا وتەیەك لە لایەن عەبدوڵلا عەزیز خالیدەوە خوێنرایەوە کە باسی ژیانی ئەدەبیو رۆشنبیری عەبدوڵلا



عەباسو صەلاح شوانی کردو کۆڕەکەی گێرا ..
کۆڕەکە بەم ناونیشانە پێشکەش کرا [ ئاوردانەوەیەکی ئاسایی لە تەمەنی شیعریو چەند نموونەیەکی شیعری عەبدوڵلا عەباس ] .. شاعیر بە کورتی سەبارەت ژیانی تایبەتی خێزانیو ئاشنابوونی لەگەڵ شیعردا دوا [ دەربارەی ئاشنابوون لەگەڵ شیعرو لایەنە رۆشنبیریەکانی گەلەکەمانو بەپێی ئەرکەکانی ژیانو خەمو پەژارەکانی هەر لەتەمەنی حەوت ساڵیمەوە بە رەنجی شانی خۆم ، خۆم پێگەیاندوەو لە خێزانێکی هەژاریشم ، ئەوەش دەورێکی گەورەی بینیوە لە مامەلە کردنم لەگەڵ شیعرداو جێی کاریگەرێتی خۆی دیارە ] دوا بەدوای ئەوە وردە وردە رووەو دونیای بزوتنەوە هەژاوەکەی ئەدەبی کوردی ملی ناو پێی وایە : [ دیارترین ڕەنگدانەوە لە بزوتنەوەی هاوچەرخی گەلی کوردا لە کوردوستانی عیراق بانگەوازەکەی روانگەیە ] .

ئەوسا بە دوورو درێژی رۆڵێکی کاریگەرێتی بانگەوازەکەو ئەو نووسینو لێکۆڵینەوانەی دەرخست کە لەو بارەیەوە نووسران .. هەر دوا بەدوای ئەوە ژیانو تاقیکردنەوەی تایبەتی خۆی لە بواری شیعردا بەسەر کردەوەو



**گەلێ بیرو ڕاو بۆچوونی خودی خۆی دەربڕی‌و وتی [ کاتێ کە دەست ئەدەمە قەڵەم ، وای دائەنێم هیچ یاسایەك لەم دنیایەدا ناتوانی ڕێگام لێ‌بگرێ لەوەی ئەمەوێ بینووسم ، ئەینووسم ، سەربەرزم لەوەی کە ئەمەوێ هەموو هەستێکی ئینسانی لەو وشانەدا دەرببڕم کە لەلای خۆمەوە شیعر دروست ئەکات ] .**

شیعر لای شاعیر شێوەیەکی رووت‌و قوتی لە ئامێز نەگرتووەو بەڵکو لای وایە بزوتنەوەی شیعر لە بزوتنەوەی ژیان جیا ناکرێتەوە ئەگەرچی شیعر بەلای خۆیەوە تەنیا بریتی نی‌یە لە شێوەو ناوەرۆك‌و ئەڵێ [ رەخنەگر یان هەر کەسێکی تر چ پێوانەیەکی تایبەتی بۆ لێکدانەوەی خۆی دائەنێ ، ئەو راستیە لای من ناگۆڕێ کە شیعرەکانم تاقیکردنەوەی موعاناتی ژیانمن ] ...

عەبدوڵلا سەبارەت بە شیعرەکانی خۆی پەنجەی بۆ ئەو راستیە برد کە لە دوو میحوەری سەرەکیدا ئەیان بینێنەوە .

**یەکەم : ئینسانی کورد بە هەموو واتای پاکێتی‌و لێهاتویی‌و ئازایەتیە .**

**دووەم : ئافرەت وەك مرۆڤێکی مەزن‌و جوان‌و گەورەو بە بەها .**

هەر دوای بەسەر کردنەوەیەکی ئاسایی ژیانی تایبەتی‌و شیعری خۆی ، چەند نموونەیەك لە شیعری : [ سێ سەمفونیا بۆ خۆشەویستی فاتەو سالەی ئایشی ، پێشکەش کرد ] .

**دوای خوێندنەوەی شیعرەکانی عەبدوڵلا عەباس ، صلاح شوان باسێکی خێرای ژیانی شیعری خۆی کردو ووتی :**

**لە ناوەڕاستی ساڵانی شەستەوە دەستم بە شیعر نووسین کردووە ، لەم رووەوە مامۆستایانی قوتابخانەی سەرەتاییم دەورێکی کاریگەریان بووەو هۆگری دنیای شیعریان کردووم‌و لە ساڵی 1967 دا بۆ یەکەمجار لە رۆژنامەی برایی‌دا شیعرم بڵاو بووەوە ، بەلای خۆمەوە سەرەتای ڕاستەقینەی خۆم لە 1970 وە دا ئەنێم ؛ بەتایبەت پاش ئەوەی چومە رۆژنامەی هاوکاری‌یەوە لەگەڵ چەند برادەرێکی نوێ‌خواز بە ئەدەب ئاشنابووم ]**

صەلاح لای وایە مرۆڤی هۆشمەندو لەخۆبوردو ئەبێت سوود لە تاقیکردنەوەکانی ژیانی ڕابردووی وەگرێت‌و لەو ڕوانگەیەوە ڕەسەنایەتی مسۆگەر ئەکرێت ، بۆیە ئەوەی دەرخست کە شیعر کارێکی رۆژانەی بەردەوامەو ئەوەنی‌یە ، بە سەعاتێك یان دووان پارچە شیعرێك دابنێ ، بەڵکو گەلێ جار لەگەڵ تەنیا دێرێکدا واتە بەیتێکی شیعریدا هەفتەیەك یان مانگێك ژیاوە .. صەلاح لەم رووەوە زیاتر قووڵ بووەو ووتی : [ سەرچاوەی شیعر سەرچاوەی ناخی ئینسان‌و ئادەمیزادەکە خۆیەتی ، شیعرەکە لە ناخی ئادەمیزادەوە هاتبێ زۆر جار نهێنی‌وای تێکەڵ ئەبێت کە تەنانەت توانای دۆزینەوەی تەفسیری مەنطیقی‌ی نی‌یە ، لای زۆر شاعیرو خۆشم ئەمە ئەبینم ] .

صەلاح شوان دوای پیاچوونەوەیەکی پەلەی ژیان‌و تەمەنی شیعری بەشەوقەوە رووی کردە سەرەتای سەرهەڵدانی دیاردەی نوێ‌خوازی لە ئەدەبدا ، بە تایبەت بزوتنەوەی روانگەی ئەدەبی کوردی‌و ووتی [ بە نیسبەت زوربەی ئەوانەی شیعر ئەخوێننەوە ، ئەزانن روانگە چ دەورێکی بووەو تا ئێستاش رام وایە کە ئەدەبی ئەمرۆی کوردی لەسەر ئەو ڕێبازە ئەڕوات کە ڕوانگەییەکان پێیدا ڕۆیشتوون ] ... هەر لەم رووەوە صەلاح شوان بیروڕای خۆی دەربڕی‌و ووتی [ ڕێبازی ئەدەبی ڕوانگە جێ‌ی خۆی گرتووەو ئێستا ئەوەی کە هیچ پەیوەندیەکی بە ڕوانگەوە نەبووبێت کە شیعر دائەنێت‌و دێتە دنیای شیعر نووسینەوە لەسەر ئەو ڕێبازە ئەنووسێ ] ..

**ئەمەو دوای ئەو بەسەرکردنەوەیەی ژیانی تایبەتی شیعری خۆی‌و ئاوڕدانەوە لە رابردووی بزوتنەوەی**



روانگە ووتی : « شیعری دلدارەکەم لە لای خۆمەوە لە شیعرە هەرە خۆشەویستەکانمە ، بەلام لە شیعرە هەرە باشەکانم نی‌یە » . ئەوسا چەند نموونەیەکی لە شیعرەکانی خۆی پێشکەش کردو ، لە شیعری « شەوێك لە شەوانی سیمورغەوە » دەستی پێکردو چەند کوپلە شیعرێکی لە [ دلدارەکەم پایزە گەوالەیەك نی‌یە ، کۆچێکی بێ‌سەرو شوێن ، شیعرێکی بێ ناونیشان ] پێشکەش کرد ..

دوای خوێندنەوەی ئەو شیعرانە کۆمەڵێ پرسیار لەسەر هەردوو باس‌و شیعرەکان رووی کردە « عەبدوڵلا عەباس‌و صەلاح شوان » وهەریەکەیان آبێ ی تایبەتیتی‌و باری بۆچوونی خۆیان وەلامی سەرنج‌و پرسیارەکانیان دایەوە ..

●●●●●●

## ● شانۆگەری لاس‌و خەزاڵ ●

هونەری درامی وەك چالاکیەکی رۆشنبیریی ، مەیدانی نواندن رۆڵێکی دیارو خانەیەکی تایبەتی لە ژیانی سەردەمدا گرتووەو تەرجوومەی حاڵی باری رووناکبیری کردەیی‌یەو لە قالبی کاری شانۆییدا ئەمەی‌و دەر ئەکەوێت .

هێزو پێزی ئەم هونەرە بەرزە لە چۆنیەتی دەربرینی بیرو راو چەسپاندنی لەلای بینەر راستەوخۆ بەستراوە بەوەی ئەکتەر چۆن ئەرکەکانی سەرشانی لێ هاتوانە بەجێ ئەهێنێ‌و خۆی لەگەڵ دەقەکەدا ئەتوێنێتەوەو لە دنیای دەرەوەی شانۆکە دوور ئەکەوێتەوە ، خۆ گەر دەقەکە خۆماڵی بوو ئەوا باری گونجاندن‌و توانەوەکە خۆشترو ئاسایی‌تر ئەبێت ..

لاس‌و خەزالەکەی لای خۆشمان وەك چیرۆکێکی فۆلکۆری رەسەنی کوردی لەدێر زەمانەوە دەماو دەم‌و بە نووسراویش بۆمان جێ‌ماوە ، ئاوردانەوەو بایەخدان پێ‌ی لە شوێنی شیاوی خۆیاەتی ، بە مەرجێ لە گەورەیی‌و بەرزیتی‌و پیرۆزی ناوکەکەی کەم نەکرێتەوە ، بەڵکو پێویستە زیاتر لای وەچەی داهاتوو شیرنترو پیرۆزتر بکرێت‌و سوودبەخش‌تر بێت .

تیپی سینەماو شانۆگەری لقی هەولێر وەك چالاکی‌یەکی رۆشنبیری‌و هونەری لە رۆژانی 7 — 15 / 1 / 1983 ، ئەم بەرهەمە نەتەوەیی‌یان لەسەر شانۆ پێشکەش کرد ، « 32 » کورو کچی لێهاتوو هاوبەشی پێکهێنان‌و ئامادەکردنی شانۆگەریەکەیان کرد .

ئەم شانۆگەریە لە نووسینی « ئامادەکردنی » ناظم دلبەندەو لە لایەن « صباح عبدالرحمن » ەوە دەرهێزاوەو بۆ سەر شانۆ ئامادە کراوە .

ناوەرۆکی شانۆگەریەکە وەك گەلێ بەرهەمی فۆلکۆری نەتەوەکانی رۆژهەلات باسی بەسەرهاتی ژیانی دلداری ئەکات .. دلداری لەنێوان لاسی کوری ئەحمەد خانی باڵەیەتی‌و خەزالی مەلا نەبی .. ئاکامی دواییان هەروەك زۆربەی هەرە زۆری دلدارو دولبەرێکی راستەقینەی‌تر ئاواتیان ئەبەنە ژێر گڵەوە .

ناوەرۆکی ئێستای شانۆگەریەکە ئەگەرچی تەواو لەگەڵ دەقە هەرە کۆنە فۆلکۆریەکەدا جیاوازی پێوە دیارەو سیماو شەقڵ خۆی لەدەست داوە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا رەسەنایەتی جەوهەری بابەتەکە ، لایەنی رۆشن‌و بێ‌گەردو بەهاکانی ناو کێشەی کۆمەڵگای ئەوسای دەرخستوەو رووی راستی مێژووی جێماوەکانمانە ، ئەو راستیەی لەناو کوردا

دەرخستووە کە ئافرەتی جوامێرو ئازاو لێهاتووی تیا هەڵکەوتووەو بە باشی‌و بێ گری‌وگۆڵ سەرپەرشتی کاروباری عێڵ‌و ناوچەکەی کردوەو سەر بەرزانە کاری خۆی ڕاپەڕاندووە ..

هەڵچوونی کێشەو سۆزی ناو شانۆگەریەکە لەو ساتەوە سەر هەڵئەدات کە « لاس » ی ئازاو سوارچاکی کورد عاشقی خەزاڵی قەشەنگ‌و داوێن پاک‌و دەست ڕەنگینی ئەبێت‌و ناچار دەست لە ژیانی شادی خۆی هەڵئەگرێت‌و بە نانە شوانی لای خەزاڵی مەلا ئەبی رازی ئەبێت .. بۆیە لاس دوێن‌و چیا تەی ئەکات ، تا خۆی ئەگەیێنێتە لای خەزاڵ ، ئەوسا تەواو بەتیری عەشق گرفتار ئەبێت‌و لە هەمان ساتیشدا خۆشەویستی پاک لای خەزاڵیش سەر هەڵ ئەدات ، هەر لەوساتەوە خەزاڵ گومان لە شوانێتی لاس ئەکاو ئەم خۆی دەرناخات تا ئەو کاتەی ڕێکەوت دووچاری شەڕی دەستەو یەخەی ئەکات لەگەڵ پیاوێکی نەیاری خەزاڵ‌و بەوەش برینی دوژمنایەتیەکی کۆنی نێوان دوو عێڵ ناحەز بەیەک ئەکوڵێتەوە .. دیارە خەزاڵێکی ئاوا شۆخ‌و جوان گەلێ شەیداو عاشقی ئاشکراو پەنهانی هەیە ، بۆیە لە هەموو لایەکەوە پیلانی بۆ ئەتەنن ، تا دواجار ناحەزێکی خەزاڵ نامەردانە زەفەر بەلاس ئەبات‌و بەتیرێکی ژەهراوی ئەیپێکێ .. ئەو ڕووداوەش گەلێ بەسەرهاتی مێژوویی دوورو



نزیکمان بۆ دووپات ئەکاتەوە کە چۆن‌و هەمیشە کەڵە پیاوی مەردو ئازا بەدەستی بۆرە پیاوی بوودەڵەی کەم فرسەت لەناو چووە .. ئاکامی شانۆگەریەکە بە کارەساتێکی تراژیدیای دڵتەزێن کۆتایی دێت .. شایانی باسە تێکڕای هاوبەشانی شانۆگەریەکە دڵسۆزانە خۆیان ماندو کردبوو .. با وەك هونەری تازەی شانۆگەری ئەگەیشتبێتە لوتکەی ئاوات ، هیچ نەبێ گەلێ خونچەی تازە پشکوتوو دەمی کردەوە ، لەسەرووی هەموویانەوە خوشکە مژدە جلال جۆبار .

**● لەگەل هونەرمەند « صباح عبدالرحمن » دا ●**

**هونەرمەند کاك صباح عبدالرحمن یەکێکە لەو لاوە چالاکانەی بەشەوقەوە بەشداری گەلێ شانۆگەری کوردی کردووە ، چ لەسەر تەختەی شانۆ یان لە تەلەفزیۆن ، چ وەك ئەکتەر یان دەرهێنەر .. ئەم هونەرمەندەمان دەورێکی باشی هەبوو لە پێشکەش‌کردنی شانۆگەری ( لاس‌و خەزاڵ ) داو هەر خۆیشی دەرهێنەریەتی‌و بۆسەر شانۆشی ئامادە کردووە .. جا بەو مەبەستەی ئاشنای هەندێ لایەنی ژیانی هونەری‌و تایبەتی کاك صباح بین ئەم چەند پرسیارەمان بەرەو ڕووی کردەوە :**

● شادومان دەبین گەر خۆتان بە خوێنەرانی گۆڤاری « کاروان » بناسێنن :

● ناوم « صباح عبدالرحمن عبداللە » یە ؛ ساڵی 1946 لە دایك بوویمەو بەڕەچەڵەك خەڵکی ناوچەی خۆشناوەتیم ؛ پلەی خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندیم تەواو کردووە ..

● لە ساڵی 1966 دا ئامۆژگای هونەرە جوانەکان ـ بەشی شانۆ ـ م لە شاری بەغدا تەواو کردووە ؛ ئێستاش سەرپەرشتیاری هونەریم لە بەڕێوەبەرایەتی جموجۆڵی قوتابخانەکان‌و لێپرسراوی بەشی شانۆشم لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر ..

● یەکەم بەشداری کردنت لەسەر شانۆدا چی‌بووە ؟ ـ لە ساڵی 1960 دا کە قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندی بووم ، بەشداری شانۆگەری « هەر بژیت » م کرد کە مامۆستا « صفوت الجراح » دەرهێنەری بوو ..



● ژیانی هونەری شانۆکەریت لە کەیەکـەوە دەستی پێ کردووە ؟ .

- بەلای خۆمەوە ، تەمەنی ژیانی هونەریم « 23 » ساڵەو هەر لە ساڵانی 1954 – 1955 ەوەشەیدای ئەم هونەرە بەرزە بوومو لەگەڵیدا دەژیم .

● دەبێ دوا بەرهەمی هونەریت چی بێت کە بەشداریت تیادا کردووە ؟ .

- بێگومان دوا بەرهەمی هونەریم کـە بەشـداریم تیادا کـرد شـانۆگـەری « لاسو خەزاڵ » بـوودیارە جگـە لە هاوبـەشی ئامادەکردنی ، خۆشم دەرهێنەری ڕاستەوخۆی بووم .

● عیشقو خـۆشـەویسـتی لە شـانـۆگـەری « لاسو خەزاڵ » دا چۆن ئەبینی ؟

- خۆشەویستی ناو شانـوگەریـەکە واتـا خۆشـەویستی نێوان لاسو خەزاڵ ، لە دڵی هەموو لایەکدا جێگای خۆی کردبووەوە ، هەربۆیەشە لاس لە مەیدانی وەدی هێنانی « مـەرج » دەڵێ [ من لەبەر خـاتری چـاوی خەزاڵێو دڵی ئێوە ، ئەم کارەش دەکەم ] .. وەشانۆگەریەکە بەمانای تەقلیدی کۆتایی هاتو بەمانای ئەو عەشقە گەورەیـەی لاس کۆتایی نەهات ، هەروەك کۆڕس دەڵێ :

« بینـەری بەڕێـز : گـەر شـانـۆگـەری کـۆتـایی بێتن ، خـۆشەویستی لاسو خـەزاڵ کۆتـایی نـایێ ، ئـەو دڵە گـەورەی ملـە دەرویشیو لاسی ئەحمـەد خان ، جێگـای هەزاران دڵی عاشقی وەك مەی تێدایە »

● مژدە جەلال جۆبار .. یا خەزاڵی مەلا نەبی ●

لە شانۆگەری « لاسو خەزاڵ » دا خوشکە مژدە جەلال جۆبار وەك ئەکتەرێکی کارامە دەوری خەزاڵێ بینیو گومانیش لەوەدا نی‌یـە کە جێگـایەکی دیـاری هـەبـوو لای بینـەرانی شانۆگەریەکە ئێمەیش بە باشمان زانی کە ئەم چاو پێکـەوتنە کورتە لەگەڵ ئەو خوشکە هونەرمەندە بکەینو چەند پرسیارێکی ئاراستە بکەین کە لە وەلامیاندا ووتی :

● ناوم : مژدە جەلال جۆبارە ؛ لە ساڵی 1960 دا لە شـارە ضنجیلانەکەی کۆیە لەدایك بووم ؛ خوێندنی سەرەتاییو



ناوەندیو ئامادەییم هەر لەوێ تەواو کردووە ، ئێستایش قوتابی پۆلی چوارەمی کۆلیجی ئادابم - بەشی کوردی - لە زانکۆی « صلاح الدین » .

● یەکەم چالاکی هونەری کە بەشداریت تیادا کردووە چی بوو ؟ .

- بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە دەڵێم ، یەکەم چالاکی هونەری کە بەشداریم تیادا کردووە شانۆگەری « لاسو خـەزاڵ » بوو ..

● چـۆنەو لەبـەرچی دەوری خەزاڵت پێ سپێـردرا ، لە کاتێکدا کە تۆ یەکەم جارتە ئەچیتە سەر شانۆ ؟ .

- کاتێ کە کاکی دەرهێنەر ڕووی لە قوتابیانی بەشی کوردی - کـۆلیجی ئەدەبیـات - کردو ئـەوەی ئاشکـرا کـرد کـە پێویستیان بە عونسورێکی ئافـرەت هەیـە ، بۆ ئـەوەی دەوری خـەزاڵ ببینێ ، ئیتـر منیـان هـەڵبـژاردو منیش بەوپەڕی شادیو ڕێزو دڵسۆزیەوە بەدەنگیانەوە چووم . بـێگـومـان دوای ئـەوەی زانیـم کـە خـەزاڵ دەوری قارەمانێتی ئافرەتی کورد ئەبینێو سەرداری هۆزەکەی خۆیەتی ..

● بەلای تۆوە شانۆ چی ئەگەیەنێ ؟

- بەلای منەوە شانۆ واتای ڕێزو مەزنی ئەگەیەنێ ؛ چونکە هەر شانۆیە دەبێتە چاکترین هۆی هوشیارکردنەوەو فراوان کردنی رادەی ڕۆشنبیری‌ی لای مرۆڤ ، هەر بۆیەشە زانایان دەڵێن : « نانو شانۆم بدەرێ گەلێکی ڕۆشنبیرت ئەدەمێ » .

● بێگـومـان هـەر ئـەنـدامێکی ئـەم کـۆمـەڵەی ئێمـە پـرۆژەیەکی بـۆ دوا ڕۆژ دانـاوە ؛ دەکـرێ پرۆژەی دوا ڕۆژی خۆتمان بۆ دەستنیشان بکەیت ؟ .

- وەك هـەر ئەنـدامێکی دڵسۆزی ئـەو کۆمـەڵە ، تـا لە تـوانامـدا هەبێت هـەوڵ ئەوە ئـەدەم بەرزتـرین پلەی خوێندن تەواو بکەم ، گەر دەرفەتیشم بوو ئەوە بە هەموو دڵەوە حەز ئەکەم لە دوا ڕۆژدا خۆم لەسەر شانۆ ببینمو دەورێکی وابگێرم ببێتە مایەی بەرزکردنەوەی پایەو پلەی ئافرەتی کـورد لە هەمـوو مەیـدانەکـانیکـۆمەلایـەتیو ئابووریو ڕۆشنبیری‌دا ..



# لــە ســلێمانی

- ئاسۆس -
ئامادەی کردووە

## کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کوردو بەرهەمی [سەڵەی نانکەر]

هونەرمەندی ناسراو «قاسم محمد» چیرۆکە بە ناوبانگەکەی غائب طعمه فرمان - النخلة والجیران -ی لە کاتی خۆیدا بۆ شانۆ ئامادە کردبوو وە ماوەیەکی باش لە بەغدادا پیشان‌درا ، لە دواییدا بۆ تەلەفزیۆنیش تۆمارکرا . زۆربەی بینەرانی کوردستان خەلیل شەوقی‌و یوسف العانی‌و ناهیدەو زەینەبیان لە بیرە کە سەرکەوتوانە دەوریان لەو شانۆ نامەیەدا دەبینی ...

لێرەش لای خۆمان کاک فوئاد مەجید میسری بە دەستکاریەوە ئامادە کردنەکەی «قاسم محمد»ی کردوە بە کوردی ، وە بەناوی [سەڵەی نان‌کەر] ەوە ، کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لە هۆڵی قوتابخانەی ئامادەییی کوڕانا لە رۆژی 9/ 1/ 1983 و رۆژانی لەوەودوای ئەم بەرهەمەیان پێشکەش کرد .

هونەرمەند کامەران رەؤوف دەرهێنەری شانۆییەکە دەربارەی ئەم شانۆ نامەیە دەڵێ :

«شانۆییی سەڵەی نانکەر چەند تابلۆیەکە رووناکی دەخاتە سەر بەسەرهاتەکانی ساڵانی پێشوو . کاتێ بەگژا چوون و مل ملانێ رۆڵی خۆی بینیوە دژ بە ئینگلیزی داگیرکەر ، کە سان و بەسەرهاتەکان دەمان گەیەننە مانای ژیان ... ئەندێشە ... ڕاستی ... هەستی پیرۆز ... ناپاکی ... ئاسۆی رووناک ... مل شۆڕی ... سەر بەرزی . پەردە لە رووی تارماییی تاریک و رەش لادەبەن .»

ئەوەی شیاوی باسە ژمارەیەکی زۆر لە هونەرمەندانی کۆمەڵە لەم شانۆ نامەیەدا بەشدارییان کردوە لەوانە :

عەبدوڵلا ئەحمەد حسین لە دەوری مامە قالەدا
رێبوار محمد لە دەوری کەسی یەکەمدا

ئاسۆ صدیق لە دەوری حەمەسەعیدا
روناک محمد امین لە دەوری زبەدا
عومەری کەریم ئاغا لە دەوری رەشەدا

صلاح قادر حەمە رەشید هەرەس لە دەوری عەزەی پاسکیلچیدا
شەماڵ عەبدوڵلاو هەڤاڵ غەفوور لە دەوری حسێنا
بەیان رەشید لە دەوری لوتفیدا

سیامەند صالح لە دەوری کەسی دووەمدا - ئەفسەر
حسام‌الدین عمر لە دەوری کەسی سێیەمدا - هادی
محمد عەزیز لە دەوری کەسی چوارەمدا - قالە

نازەنین رەزا ئەحمەد لە دەوری سەڵەی نانکەرا
ئەحمەد سالارو عەبدولی حەمە جوان لە دەوری مستەفای دەلاڵ



تاها خەلیل دڵسۆز          لە دەوری محەی خانچیدا
ئاشتی عوسمـان دانش          لە دەوری حەمـەی فاتـە
ز لەدا

پەری ئەحمەد مەحموود          لە دەوری شەمسەدا
تارا تاها خەلیلو هاوكار          لە دەوری منالەكاندا
عەبدول قادر مستەفا          لە دەوریَ میرزادا

محمد قادرو ئاكۆ عومەر          لە دەوری كریكۆردا
حەمەسەعید مستەفا          لە دەوری رەحیمدا
بڕوا نوری          لە دەوری فەتاحە فەندیدا

میدیا رەؤوف          لە دەوری تەهادا
زاهر غەریب          لە دەوری عەبباسدا
ئاراس تەبیب          لە دەوری خەلفە ئەحمەدا

تی‌بینی : لە رۆژی 23/ 1/ 1983دا شـانـۆگـەریـەكـە بـە هـۆی نەخۆشی‌یەكیَ لە خوشكە ئەكتەرەكانەوە [وەك سەرۆكی كۆمەڵە رای گەیاند] بۆ ماوەی چەند رۆژیَ پێشكەش نەكرا ، لە رۆژی

29/ 1/ 1983وە دەست بە پێشكەش كردنی كرایەوە دوای ئەوەی «شاد ان فؤاد محمد ئەمین» دەوری سەلەی نانكەری وەرگرت و «ئاشتی عەلی» دەوری زبەی پیَ‌سپێررا .

دەربارەی تێكرای شانۆنامەكە سەرۆكی كۆمەڵە هونەرمەند طه خلیـل وتی : «شانـۆ گەریـەكەمـان باسی ئـەو سـەردەمـەی دەسـەلاتداریتی رژێمی پـاشایـەتی ئـەكـات ، لە كـاتێكـدا ئینگلیزەكان وتەكان خستبووە ژێر دەستی خـۆیانـەوە ، بەلاَم میلەت دەستەوسان نەوەستاو مل بۆ ئینگلیزەكان شۆڕ نەكرد ، كەوتە بەربەرەكانیَ ، ئەم شانۆگەریە بەرگێكی كوردی لەبەر كراوەو بـریتیە لە چـەند تـابلۆیەك كـە تێكـۆشـانو بـەربـەرەكـانی نەتەوەكەمان دەردەخا ، لە شارێكی كوردستانا میلەت پەردە




لەسەر رووی ئەو كەسانە هەڵدەماڵیَ كە بێگانە پـەرستو خۆ فرۆشن»

پیرۆز باییمان بۆ كۆمەڵەی هونەرە جوانەكـانی كوردو ئـاواتە خوازین بەردەوام‌بن لە سەر پێشكەش كردنی شانـۆ نامـەی بەهێزو پێشخستنی هونەری شانۆ لە كوردستانا

• • • • •

## بەرهەمی نویَ‌ی تیپی پێشرەوی شانۆی كوردی

لە سەر شانۆی چالاكی قوتابخانەكان لە سلێمانی رۆژی 16/ 1/ 1983 و رۆژانی دوای ، تیپی پێشرەوی شانـۆی كوردی شانۆ نامەی [ڕاستی‌یەكە مرد]ی پێشكەش‌كرد ، ئەم شانۆییە لە نووسینی (عەمانوئیل رۆبلس) ە ، هونەرمەند ئازادی حەمە بچكۆل كۆڕیویەتە سەر زمانی كوردی‌و هونەرمـەند عـوسمان چێوار دەری هێنابوو .

ناوەرۆكی شانۆ نامەكە بـاس لە داگیركـردنی شارێكی ئەسپانیا دەكات لە لایەن هێزەكانی فەرەنساوە ، لەگەڵ ئـەو بەرگری‌و فیداكاری‌و خۆبەخت كـردنەی ئیسپـانیاییـەكان لە پێناوی ووڵاتەكەیاندا .





هێلی درامی شانۆییەکە لەوەوە سەر هەڵدەدات کوڵونیل جیوارز کە ئەفسەرێکی ئەسپانیاییەو لێپرسراوی قەڵایەکی گرنگە ، لە قەڵاکە دەکشێتەوەو سەربازەکانی فەڕەنسا دەچنە ناوی ، گرتنی ئەو قەڵایە مەترسیەکی گەورە بۆ سەرشارەکە پەیدا دەکات ، جا ئایا ئەم کشانەوەیە ناپاکیە یان تاکتیکە ؟ دانیشتوانی شار دەست بە خۆپیشاندان دەکەن و ئەفسەرەکە بە ناپاك دادەنێن ، هەروەها حاکمی عەسکەری شاریش ژەنەراڵ (دون ئەنریك) ئەم کارەی جیوارز بە ناپاکی دەداتە قەڵەم ، لە ڕاستیدا جیوارز ئەفسەرێکی دڵسۆزی نیشتمان پەروەری خۆ بەختکەرە ، دوو دڵی لە پاکێتی‌ی ناکرێت . کشانەوەشی لە قەڵاکە پاساوی خۆی هەیەو ڕەنگە دەستی ژەنەراڵیشی تێدابێت . چۆن ئەم فەرمانەی بە سەرا دەدرێ ؟

ئەگەرچی ژەنەراڵ ئەنریکیش هەر ئەفسەرێکی بە جەرگ‌و شۆڕشگێڕەو لە گەڵ هیچ ڕایەکدا ناگونجێ کە لە بەرژەوەندی فەڕەنسیەکان بێ . تەنانەت خەباتکەرێکی وەك (کریستوباڵ) یش دەکوژێ چونکە کوڕەکەی لە سەربازی ڕای کردوەو شەڕ بۆ ئەسپانیا ناکات . ململانێ‌و کێشە لە نێوان دوو مەنتیقی جیاواز دایە یەکەمیان مەنتیقی [ئەنریك] کە تەنیا بە زمانی سەربازی‌و خوێن ڕشتن دەیەوێ پارێزگاری لە شارەکە بکات‌و دووەمیان مەنتیقی جیوارزە کە بە مرۆڤایەتیەوە بۆ مەسەلەکە دەچێت‌و هەموو جارێك بە چاوی شەڕو کوشتار نابینێ ، ئەم دوو مەنتیقە ئەبنە دوو سەری دژ بە یەکی مەسەلەکەو ڕوو بە ڕووی یەك دەبنەوە ، بەڵام بۆ ئەو حاڵەتە مەنتیقی عەسکەری زیاتر خۆی دەبینێ ، تەنیا لەبەر ئەوەی هێزە فیداکارەکانی ئەسپان دوو بەرەکی‌یان تێ نەکەوێت‌و دوشمن سوود لەوە نەبینێ جیوارز گوللەباران دەکرێت ، مردنی جیوارز مردنی ئەو ڕاستیەیە کە لە نێوان ئەو دوو سەرەدا ون دەبێ ، دیارە مردنی ڕاستیەك کە پێوەندی بە تاقە کەسێکەوە هەبێ‌و لە نێوان ڕاستی‌و گوماندا بیهێڵێتەوە لەوە بچووکترە کە حەقیقەتێکی گەورەتر داپۆشێ کە پەیوەندی بە سەرجەم چارەنووسی کۆمەڵێکەوە هەبێ .

دیکۆری هەرسێ پەردەکە هۆڵی کتێبخانەیەك‌بوو دەورەکانیش بەم شێوەیە دابەش کرابوو

**گوڵاڵە جەلال : ئۆفیلیا**
**ئاکۆ عەزیز : جۆلیان**
**صباح محمد رشید**
**رزگار عبدالله**
| ئەنسلمۆ .
**سروە عزت : دۆنامانیۆلا**
**سیروان جمال : دۆن‌دیاکۆ**
**ئازاد حەمەبچکۆل : دۆن‌ئەنریك**
**هیوا محمد امین : لۆرانزۆ**
**نەهرۆ صالح : جیوارز**
**یاسین قادر : کریستوبال**
**بەرزان محمود : میراندا**

دەرهێنەر کاك عوسمان چێوار ئەم بەرهەمەیانی پێشکەش کردبوو بەوانەی بۆ ڕاستی دەژین‌و دەسووتێن شیاوی باسە ئەم تیپەش ڕۆژی 21/ 1/ 1983 تا ماوەی دوو ڕۆژ شانۆنامەکەیان ڕاگرت بە هۆی نەخۆشکەوتنی یەکێك لەو خوشکانەی دەوری سەرەکی هەبوو .

لە کۆتاییدا تێبینی‌یەکم هەیە بە پێویستی ئەزانم بیخەمە بەرچاو کۆمەڵەو تیپە هونەریەکان ، تا ئەتوانن بەرهەمەکانیان نەخەنە کاتی تاقیکردنەوەی قوتابیانەوە ، ئەمە لە لایەك‌و لە لایەکی تریشەوە بریا کەمێك ئاگاداری وەرزیش دەبوون ، چونکە وارێکەوت ڕۆژانی پێشکەش‌کردنی ئەم دوو شانۆنامەیە ، ڕۆژانێکی زۆر ساردو سەرمابوو .

پیرۆزبایمان بۆ تیپی پێشڕەو ، هیواداریین لە پێشکەش‌کردنی بەرهەمی سەرکەوتوو کە متەرخەمی نەکەن‌و لە گەڵ هونەرمەندە دڵسۆزەکانی ترا چالاکانە هەوڵی پێش خستنی شانۆی کوردی بدەن ...

**سڵاو لە هەموو هونەروەرێکی دڵسۆز کە شەیدای هونەرەکەیەتی‌و بۆی دەسووتێ .**

# چاوپێکەوتنی ئەمجارەمان

ماموستا رەؤوف بێگەرد ، وەك زوربەی ئەو لاوانەی لە سەرەتاوە حەز لە شیعر ئەکەن ، ئەمیش سەرەتاکەی لە شیعرەوە دەست پێ دەکات ، بەلام لەپال ئەوەشدا عەشقی چیروك لەدل و دەروونیا بوە ، بۆیە ، یەکەم بەرهەمی لە سالی957 دا کە لە گوڤاری ( هەتاو ) دا بلاوی کردەوە چیروك بوو ، ئەگەرچی لەو ساتەوە سەرو مڕ بەردەوام نەبوە ، بەلام لە سەرەتای سالی 970 وە ، وەك چیروکنووسێکی لێهاتوو ، هاتە نێوەندی ئەدەبیەوە ، دوای کونگرەی چوارەم یەکێ بوو لەو ئەندامانەی بو دەستەی بەرێوەبەری لقی سلێمانی هەلبژێررا . هەروها پاشی کونگرەی پێنجەم لە 15 / 10 / 1978 بە ئەندامی دەستەی بەرێوبەری لقی سلەیمانی هەلبژێررا ، وە ماموستا رەؤوف یەکێ بوو لەئەندامانی «دەستەی نووسەرانی گوڤاری ( دەنگی ماموستا ) . تائێشیا دوو بەرهەمی چاپکراوی هەیە کە بریتیە لە دوو کومەلە چیروك( بوارو ) و ( هەوار ) .
بە پێویستمان زانی لەم چاوپێکەوتنەدا دوو پرسیاری ئاراستە بکەین ، فەرموون ئێوەو ، وەلامەکانی بێگەرد .

● چیروکی ئەمڕوو دوێنێمان چون هەلئەسەنگێنیت؟

- کە باس لە چیروك ئەکەین پێویستە پێشەکی باس لە چیروکنووسەوە بکەین ، چونکە چیروك بەرهەمی مروڤێکە پەیوەندیەکی بەتین لەگەل کومەلگاو چینو دەورو بەریاهەیە ، چەندە ئەم ئەیەوێت کاریان لێ بکات ئەوەندەیش ئەوان کاریان لەم کردوە . بێجگە لەوەی تاقی کردنەوە تایبەتیەکانی ژیانی خودی نووسەریش سەرچاوەیەکن دەرژێنە هەمان رووبارەوە . هەر نووسەرێکیش چەندە لە باری گورانکاریەکانی ناو کومەلو بەرەوپێشەوە چوونی ژیانو کێشەو رەوتی مێژووەوە هوشیاری هەبێت نابێتە چیروکنووس ئەگەر هوشیاری هونەری نەبێتو نەتوانێت لە نێوان ئەم دوو لایەنەدا هاوسەنگیەك بکات . تێکەیشتنی ئەم دووانە ئەو ئەدەبە رەسەنە دێنێتە کایە کە بە



خەلکیەوە دەبەسرێتو ، نابێتە ئەدەبی تایبەتی کەسێك کە لە ئەنجامی هەلچوونو داچوونە زاتیە داخراوەکانەوە سەرهەلبداتو لە شوێن خویدا خەفە بێت . هەروەك نابێتە ئەو ئەدەبەی کە رەنگدانەوەیەکی میکانیکی ژیان بێتو جێگای بەهرەمەندیو سەنعەتکاری تیا نەبێتەوە .

چیروك لە هەموو سەردەمێکدا مورکی قوناغ و کومەلەکەی خوی هەلئەگرێت ، بەلام بە ئوسلووبی تایبەتی نووسەران ، چیروکی سەدەی نوزدەی رووسیا چیروکی سەدەی بیستەم نیە ، چونکە هەر رژێمێکی کومەلایەتی خاوەن رەوشتو پەیوەندیو باری تایبەتی خویەتی ، کەواتە ئەدەبەکەیشی لە رژێمێکی تر جیاوازە . چیروکی کوردیش سیماو مورکی ئەو قوناغانەی پێوەیە . لە سەردەمێکدا ناوەروکی زوربەی هەرە زوری چیروکی کوردی کێشەی نێوان جوتیارو دەرەبەگی ئەم وولاتە بوو ، لای نووسەرە هوشیارەکان بە هونەری چیروكو بیری سەردەمەکەیان کێشەکە دەگەیشتە پوپەی تراجیدیاو ، رووی راستەقینەی رژێمە گەندەلەکەی تیا دەردەکەوت . چیروکەکانی کوێرەوەریو کەرەلوتی مەنووچەرو ، گای پیروزو ، پونەزەنگی حەمە سەنو ، خالە حەمەو ، لالو کەریمو کارمان دەوێتو ، چەندان نموونەیتر شایەتی ئەم راستیەن . هەر لەو مەیدانەیشدا هەبووە بە ناوی چیروکەوە ئاموژگاری ئاینو بیری چاکەخوازیو شتی میللی نووسیوە ، بەلام لەبەر ئەوەی هونەر مەند نەبوون بەرهەمەکانیان نەبوونەتە چیروكو خراونەتە خانەی ترەوە . هەر بە پال ئەو کێشە چینایەتیەوە هەندێك لە نووسەرە هوشیارەکان هەستی کێشەیەکی تریان

کردوه که کێشەی مرۆڤی کوردو ستەمی نەتەوایەتیە ، جا بە داهێنانێ ئەو ڕووداوو کارەساتانەبێت کە ڕاستەوخۆ نموونەی ژیانی نەتەوەکەیە ، یان شانازیبێت بەو سەردەمە مێژووییانەوە کە لە قۆناغێکی ژیانیدا هاتۆتە گۆڕێ ، نموونەمان شای قەرەجەکان و بێ وولات ینم و پێشمەرگەو قەلای دمدمە .

ئێستای چیرۆکی کوردی بەشێکی تەواوکەرو زنجیرەیەکی نەپساوەی ژیان و ململانێی نەتەوەکەیەتی ، چوونە ناو ئەو کێشەو دژوارییانەیە کە دەورووبەری مەسەلەکەیان داوە چیرۆکی کوردی ئەمڕۆ مولتەزیمە بە هەموو مانایەکی ئیلتزام ، بۆیە ئەو گەرم و گوڕی و شکۆیەی لە ئێستای چیرۆکی کوردیدا دەیبینین بە ڕووی هیچ سەردەمانێکی تریەوە نەمان بینیوە . وابزانم هەرە زۆری چیرۆکی ئەمڕومان ئەگەر بە دونیادا بگێڕیت پێناسەی کێشەی نەتەوایەتی و بون و بەرامەی ئەم خاکەی لە گەڵ خۆیدا هەڵگرتووە . ئەمە بێجگە لەوەی کە چیرۆکنووسەکانی ئەمڕۆمان خاوەن میراتێکی کەڵچەری ئەم هونەرەن و دڵسۆزانە دەیانەوێت چیرۆکی نەتەوەکەیان بەرەو پێشەوە بەرن . کە ئەمەیش لە خۆیدا هەست بە لێ پرسینەوە کردنە بەرامبەر ئەرکە پیرۆزەکانی هونەرو ڕوناکبیری نەتەوە .

## ● سیمای پاڵەوانی چیرۆکی کوردی چۆن ئەبینیت ؟

- تا ئێستایش لای هەندێک ڕەخنەگری لای ئێمە وایە کە پاڵەوانی هەر چیرۆکێک نموونەی هەمەلایەنەی ژیانی کۆمەڵکەیەتی ، بۆیە زۆربەی حوکمە ڕەخنەییەکانمان لە بنەڕەتەوە دەپووکێنەوە ، پاڵەوانی هەر چیرۆکێکی کورت خاوەن یەك بوعدەو ناتوانێت هەموو بوارەکانی ژیان بەسەرجەمی دەربڕێت ، چونکە سنووری چیرۆکی کورت لە خۆیدا تەسکەو تاقە حاڵەتێکیشە ، ڕەنگە سیماو بوعدە دەروونی و کۆمەلایەتی و فەلسەفیەکانی هەر پاڵەوانێکی ڕۆمان چاکترو فراوانتر دەربکەوێت و . نووسەریش زیاتر داوای ئەوەی لێدەکرێت بەلام لە کورتە چیرۆکدا ئەم لایەنە کەمە . ئەبێ ئەو ڕاستیەیش بڵێین کە لە هەندێ کورتە چیرۆکی کوردی ئەمڕۆماندا سیمای پاڵەوان بەهۆی کۆمەڵێك بەکارهێنانی تەکنیکی و وەسف و چوونە دیوی ناوەوەی پاڵەوان چاکتر بەرجەستە کراوە وەك لە چیرۆکەکانی پێشوترمان .

من ڕام وایە زۆربەی چیرۆکنووسی ئێستامان کە دەست دەداتە چیرۆکێك مەبەستیەتی پاڵەوانەکەی کوردبێت ، چ لە بیرکردنەوەو هەست و نەستیاو ، چ لە ڕواڵەتی دەرەوەیدا ، بەلام بەرجەستەکردن و گەیشتن بەم ئامانجە ئەکەوێتە سەر کارامەیی و لێزانینی چیرۆکنووس ، ڕێ دەکەوێت چیرۆکنووسێك هەموو ئەمانەی مەبەستبێت ، بەلام بەدەستیەوە نایەت و پاڵەوانەکەی دەبێتە مرۆڤێکی بێ پێناسە ، کەواتە چۆن ئەتوانین پاڵەوانێك برەخسێنین بێنین هەمووشتی کوردبێت و مرۆڤێکی ڕەسەنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیش بێت . ئەمە ڕاستیەو - نهێنی - یەکی ئەمڕۆی چیرۆکی کورتمانە ، کە دەڵێم نهێنی مەبەستم ئەوەیە زۆرمان نەگەیشتووینەتە دەستنانە سەرو دەربازکردن ، کۆمەڵێك هەوڵدان هەیە ، ڕەنگە هەندێک پاڵەوان تەنیا وەك پڕیشك ئەمەی بەرکەوتبێت، نەتوارابێت تەواو گەلالە بکرێت . بە هەر حاڵ وەك مەبەست - پاڵەوانەکانی ئێستامان زۆربەیان شۆڕشگێڕو یاخین و سەر بۆ واقیع دانانەوێنن ، هەندێك جار شێت گیردەبن و دەبنە گێرەشێوێن ، هەیشیانە هێور هەنگاو دەنێت و گەلێك دیاردەی دزێو ڕادەماڵیت :

من بەلامەوە ئاساییە لەم بارەی ئێستاماندا - چ لە ڕووی ڕووناکبیری و چ لە ڕووی بەگشتی ژیانی نەتەوەکەمانەوە - پاڵەوانە کان وابینەکایەوە ، نەتوانرێت هەموو جڵەوگیربکرێن . چونکە واقیعەکە لە خۆیدا لە هەڵکشان و داکشاندایەو بزاوتی زۆری تیایە ، ئەوەی ئاگای لە ئەدەبی میللەتان بێت لەم نموونانەی زۆر دێتە پێش چاو ، بۆ وێنە زۆر بەرهەمی ئەدەبی رووسی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا لەم بابەتەن ، کە دوای پێکدادان و تێشکانەکان ڕەخساوە ، چونکە ئەدەب و هونەر لە واقیع جیا ناکرێنەوە ئەگەرچی وێنەیەکی ڕاستەوخۆی نەبن . هیچ جێگای سەر سووڕمان نیە کە پاش شەڕە جیهانیەکان گەلێك ڕێبازو قوتابخانەی جیاجیا هاتبێتە کایەو ڕەنگە لای هەندێکیش بە وڕێنە بدرێنە قەڵەم . ئێمە لە نرخاندنی ئەدەب و هونەردا سەردەمەکە دانابڕین ، کەواتە پاڵەوانی چیرۆکیش کوڕی ئەو سەردەمانەن و نابنە سۆپەرمانی بیرکردنەوەو هەڵس و کەوتی ڕۆژانە ، هەموو ئەمتاقیکردنەوانە پاڵەوانی چیرۆکی کوردی بەرەو بواری ئارامێکی تێ گەیشتوانەتر ئەبا.

ئامادە کردنی : سۆران

# گەشتێک بەنێو پۆستەی « کاروان » دا

وا بۆ جارێکی دیکەیش لە گۆشەیەکی تری پۆستەی « کاروان » دا لەگەڵ ئەو براو خوشکانەماندا بەیەک دەگەینەوە کە بابەت و بەرهەمی خۆیانیان بۆ ناردووین ؛ دووبارە رێگەی ئەوە بە خۆمان دەدەین کە لەم چەند لاپەڕەیەدا وەرامیان بدەینەوەو لە دڵیشەوە هیوای ئەوە دەخوازین کە دڵیان لێمان نەڕەنجێ و لەو هاوکاری یە دڵسۆزانەیاندا بەردەوام بن کە تا ئێستا کردوویانە ؛ بەڵکو بە ئاواتەوەین بە گوڕتر روو لەو مەیدانە بکەن و لە جارانیش گورجو گۆڵتر بن ، لێرەیشدا مەبەستمان ئەوە نیە کە ئەو خوشکو برا ئازیزانەمان هەر چیەکی وەبەر گوێیان کەوت و هەر بەرهەمێکی پێنووسەکانیان دای رشتە سەر کاغەز ئیتر ئەوە بە چاکترین و بە هێزترین بابەتی بزانن و وا بیر بکەنەوە کە لە هەموو کەمو کورتیەک پاک بۆتەوەو دەبێ بێ سێ و دوو بەسەر لاپەڕەی رۆژنامەو گۆڤارەکانەوە خۆی بنوێنێ و بڵاو بکرێتەوە ، گەر بڵاویش نەکرایەوە ئەوە ئیتر بکەونە گلەیی و دڵیشیان لەمو لەو برەنجێ .. گۆڤاری کاروان وەکو هەر گۆڤارێکی دیکەی کوردی مەبەستی ئەوە نیە کە هەموو ئەو بابەتانەی بۆی دێن لە سنووری « زۆری و بۆری » دا بخولێنەوەو بەس ؛ بەڵکو ئێمە هەمیشە چاوەمان لەوەیە کە نووسەران و ئەدەب دۆستان بابەتی بە هێزو پێزمان بە دیاری پێشکەش بکەن ، لەوەیش دڵنیاین کە زۆر لەو براو خوشکە ئازیزانەمان گەر نەختێکی تر خۆیان ماندوو بکەن ئەوە ئەو ئاوات و داخوازیە بە سووک و هاسانی بەدی دەهێنن ؛ ئێمەیش بەو پەڕی سوپاسەوە بەرهەمەکانیان قەبووڵ دەکەین و لاپەڕەکانی « کاروان » ی خۆشەویستی هەموو لایەکمانی بێ دەڕازێنینەوەو کتێبخانەی کوردی بە نووسینەکانیان دەوڵەمەندتر دەبێت ..

لەتەک هەموو ئەوانەیش کە لە پێشەوە پەنجەمان بۆیان راکێشا ؛ دووبارە هیوای ئەوە دەخوازین کە نووسەرانمان بینیان درێژ بێ و وردترو قووڵتر بیر بکەنەوەو زوو هەڵ نەچن و دوورە پەرێز نەوەستن ؛ چونکە وەکو دەزانین هەموو هەڵچوونێک هەر دەنیشێتەوەو ئەنجامی هەموو کۆششێکی هێمن و لەسەرخۆش بەرهەمی چاک و بە پێزو دەوڵەمەندو پتەوە .

ئێستاش کاروانی گەشتەکەمان دەست پێ دەکەین لەگەڵ ئەو بەرهەمو نووسینانەی پێمان گەیبوون تاوەکو لە پۆستەی ئەم جارەیشماندا وەرامی بەشێکی تریان بدەینەوەمە

● ژنا خلیین :

ئەمە ناونیشانی باسێکە کە برادەر کمال یاسین بۆی ناردووین ، ئێمەیش لە وەرامدا دەڵێین ، برا گیان بۆ بەم جۆرە سڵ لە ئافرەت دەکەیتەوەو نموونەی خیانەت کاری دەکەیتە لەکەیەک و بەنێو چەوانی ئافرەتەوەی دەلکێنی ، چاکتر وابوو لە بابەتێکەوە بدوێی کە هاندەر بێت بۆ بەرەو پێش بردنی رەوتی ئافرەتی کورد لە هەموو مەیدانەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری کە ئەمەیان ئیمڕۆ ئاواتێکی مەزنی هەموو مرۆڤێ دڵسۆزە بۆ چارەسەر کردنی کێشەو گرفتە کۆمەلایەتیەکانی ئافرەت ..

● بۆ برامان ، هاوڕێ رەشید :

خۆزگە لە جیاتی دوو پارچە شیعرە وەرگێڕاوەکەی پۆل ئێلوار ، شیعرێ یا بابەتێکی خۆماڵیانەت بۆ بناردینایە ؛ چونکە گۆڤاری ئێمە زیاتر بەتەنگ بابەتی خۆماڵیەوەیە لەتەک وەرگێڕان لە زمانە بێگانەکانەوە بۆ کوردی .

● ژ فۆلکۆرێ کوردی :

کاک ئەرجان ماری ، نووسینێکی بۆ ناردووین لەژێر ناوی « ژ فۆلکۆرێ کوردی » بەلام لەبەر ئەوەی کە بابەتێکی زۆر ساوایە بۆیە داوای لێبوردن دەکەین کە بڵاو نەکرایەوە .

● بۆ ئەم برادەرانە ؛ « ع . بەسۆز ، عبدالله کریم سعید ، ابراهیم اسماعیل حمد ، فەرهاد گەردی » ببورن کە شیعرەکانتان شیاوی بڵاوکردنەوە نەبوون و لە زۆر رووەوە لاواز بوون و لەگەڵ رێبازی گۆڤارەکەیشمان رێک نەدەکەوتن ..

● وشەی کاروان لە شیعری کوردیدا :

نووسینێکی کاک گردوان علی بوو ، بەلام لەبەر ئەوەی بە چاکی ئامانجەکەی نەپێکا بوو بۆیە داوای لێبووردن دەکەین کە بلاو ناکرێتەوە .

● برای ئازیزمان کاک فەرهاد خدر فتح الله لە هەولێرەوە :

دوو پارچە شیعری بۆ ناردووین لە ژێر ناونیشانی « هۆ کچەکەو ، قەلەم » ، وا لە هی یەکەمیان ئەم چەند دێڕەمان هەلبژاردو بلاوی دەکەینەوە ، هیوادارین لەمەو لا زیاتر خۆی بە خوێندنەوە خەریك بکات و چاکتر بە ناخی ئەدەب و کەلەپووری نەتەوایەتیماندا بچێتە خوارەوەو بۆ بلاوکردنەوەیش بە پەلە نەبێت ، ئەمەیش چەند دێڕێکی « شیعری هۆ کچەکە » یە :

هۆ کچەکە ؛
جێم مەهێلە .. جێم مەهێلە
لە شەوێکی وا بەستەلەك
لە ئاواتێکی وا بێدەنگ
لە کەنار خەمو ئەشکەنجە
هۆ کچەکە .. جێم مەهێلە .



● هەر دیسان لە هەولێرەوە کاک « سالار غەریب » ئەم هۆنراوەیەی بۆ ناردووین ؛ ئێمەیش بە سوپاسەوە وا ئەم بەشەی بۆ بلاودەکەینەوە :

« هەورامان چوو بوار نەما »

من باوەڕم کرد راستە گیانە .. بەلام هەردەم چاوم لێتە

وا ئەزانی کە لات نەماوم .. ئێستاکە من ڕقم لێتە

لات وایە کە خۆشم ناوێی .. نەخێر دڵ لە دووریت شێتە

تا بمێنم لەسەر دونیا .. لاشەی من خۆری بەرپێتە



● بۆ کاک دلێر عەزیز ئەلومنی ، لە کۆلیجی کشتوکال ، لە زانکۆی سەلاحەدین :

زۆر سوپاست دەکەین ؛ هیوادارین بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێری ، وا ئەم چەند دێڕەیشمان لەو پارچە شیعرەت هەلبژارد کە بۆت ناردبووین :

بۆ چاو چاوت لەگەلما کرد
بۆ چاوە ڕوانیت فێر من کرد
بۆچی سوزت لە دلما برد
بۆ چی وات کرد



ئێستایش دیسان تۆ حەز دەکەی
ئەو شانۆیە دووبارە کەی
گەر حەزمو گالتە کردنە
دوورکەوە لێم
حەز لە گالتەی دلدار ناکەم
چونکە پڕە لە ئێش و غەم



● برای شیرینمان کاک سلێمان مصطفی

پێشەکی زۆر سوپاست دەکەین ، ببوورە کە شیعرەکەت لاوازەو شیاوی بلاوکردنەوە نیە . هیوادارین زیاتر خۆت لەگەل شیعرو ئەدەبیاتی کوردیدا خەریك بکەیت ، ئەوسا رووبکەیتە ئەو مەیدانە فراوانەی شیعری کوردی ..

● دۆستی ئازیزمان کاک محسن محمد ـ ئەندامی کۆمەلی هونەرە جوانەکانی کورد لە هەولێر :

سوپاست دەکەین و پێشنیازەکانت مایەی خۆشیمانن و ئێمەیش دەمانەوێ ئەو هەموو حەزو ئارەزووانەی وا لە دلی تۆو دلی دەیان خوێنەری ئازیزماندا هەن جێ بەجێیان بکەین ؛ لە هەمان کاتیشدا دەبێ ئەوە بزانین کە ئەو ئاواتە مەزنانە بە ڕۆژێك و دووان ئەنجام نادرێن و پێشکەوتنی کاروانیش ئەرکی سەر شانی هەموو ئەدیب و نووسەرێکی کوردە لە پێناوی خزمەت کردنی ووشەی پاك و پیرۆزی کوردیدا ..

● بۆ کاک شەفیق رەنجلو لە هەولێرەوە :
براکیان پڕ بە دڵ سـوپاست دەکـەین بۆ ئـەو هەستی هاوکاری کردنەت لەگەڵ گۆڤارەکەمـاندا ، بـەلام دەبێ بمان بووری کە ئێمە بواری بلاوکردنەوەی ئەو جۆرە بابەتانـەمان نیەو ، چاکتر وایە ئاراستەی گۆشەی « بەیانی باش » ئیسگەی کوردی بەغدای بکەی بەڵکو سوودی لێ وەر بگرن ..

● بۆ خاوەنی چیرۆکی « نەخۆشی کۆمەلایەتیمان » :
ببوورە کە ئەوەی نووسیوتە لە چیرۆك ناکـات ، بەڵکـو گێڕانەوەی رووداوێکی کۆمەلایەتیە ، بـە شێوەیـەکی سادەو ساکار ، کە ئەم جۆرە رووداوو نەخۆشیانە هەتـا بڵێی زۆرو بلاون ، وەبۆ دارشتنیش بە شێوەی چیرۆك ئەوە دەبێ نووسەر لە زۆر لایەنی دارشتنی هونەریو تەکنیکیەوە ئاگادار بێت . هیوادارین بۆ بلاوکردنەوەی نووسینەکانت پەلە نـەکەیت ، بەڵکو وا چاکە زیاتر لە بارەی چیرۆکەوە بخوێنیتەوەو خۆتی پێ رۆشنبیر بکەیت .

● بۆ نووسەری شیعری « بۆ کچێکی جوان » :
حەزمان دەکـرد ئەو شیعـرەی بۆ ئـەو کچە جـوانەت نووسیوە ، لە رووی هونەریو دارشتنیشەوە رەنگدانەوەی ئەو جـوانیو شۆخیـیـە بوایـە کە ویستـووتـە لە چـوار چێـوەی شیعرەکەتدا دەری بخەیت ؛ ببوورە کە شیاوی بلاوکـردنەوە نیە ، چاوەنواری بەرهەمی ترتانین ..

بـۆ برادەران کـاك « فیصل عبـدالله ، عبدالواحـد ادریس ، محمـد حسن بنالی ، حیسـام الدین بـرزنجی ، یـاسین محمـد ، رەمەزان ئیبـراهیم ، ئیبراهیم عـوسمان خۆشناو » ببوورن لەوەی کە بۆمان نەکرا بەرهەمەکانتان بلاوبکەینـەوە ، چونکـە لەگەڵ رەوتی گـۆڤارەکـەماندا نەدەگونجان و لە زۆر لایەنی هونەریشەوە کەمو کـورتیان تیادا هەموو .

● بۆ کاک حەمە نوری عمر کاکی :
زۆر سوپاست دەکـەین ؛ هیوادارین لەمـەو دوا باس و نووسینی چاکترمان بۆ بنێری ، تاوەکو بتوانین بلاوی بکەینەوە

● کاك عەباس سالح عەبدوللا : سوپاس بۆ بەرهەمەکەت بەلام لەبەر ئەوەی لە زۆر رووەوە لاوازو بێ هێز بوو بۆیە نەشیا بلاوی بکەینەوە ، بەهیوای بەرهەمی پتەوترتانین ..

● بـۆ ئەم بـرایانـە « بەنـدی لە کـەرکـوکـەوە ، ئـاری لە هەولێرەوە ، ر . ع . پیربال لە هەولێرەوە » دەبێ ببوورن کە ئێمە ئەو بابەتو بەرهەمانەی ناوی تەواوی نووسەرەکانیانی بەسەرەوە نـەبێت بلاوی نـاکەینـەوە ، هەرچـەندە شیـاوی بلاوکردنەوەش بێت ، بۆیە داوا لەو خوشـكو برایانە دەکەین کە بەرهەمو نووسینی خۆیانمان بۆ دەنێـرن ناوو نـاونیشانی تەواوی خۆیانیان بنووسن بۆ ئەوەی ئێمەیش بتوانین بڕیاری لەسەر بدەین ..

● برایانی ئازیز کاك « نجم الدین صالح ، قاسم مفدید ، محمد کریم نانەوا لە هەولێرەوە ، اسماعیل حسین محمد لە دهۆکەوە ، عومەر مەرگەیی لە بەکرەجۆ ، وە کاك صالح یوسف کاکە حەمە لە کـەرکوکـەوە » . ببوورن کـە بەرهـەمـەکـانتـان شیـاوی بلاوکردنەوە نەبوون و سوپاستان دەکەین ..

● خوشکێك بە ناوی « نازدار » لە هەولێرەوە :
شیعرێکی بۆ ناردووین ، پێشەکی لە ناخی دڵەوە سوپاسی ئەو خوشکەو ئەو هەستە پڕ لە دڵسۆزیەی وەکەین ؛ بەلام دەبێ بمان بورێ کە بۆمان نەکرا شعیرەکەی بە تەواوی بلاوبکەینەوە لەبەر زۆر کەمو کورتی هونەری ، بەڵکو هەر تەنها ئەو چوار دێرەی خوارەوەیمان بەدڵ بوو ، ئێمەیش بـە ناوی خـوشکە « نازدار » هوە دەیکەینە دیاری بۆ خوێنەرانی گۆڤاری کاروان :

هەموو ئەستێرەی کەشی ئاسمان
ئەکەینە چراو مەشخەڵی ژیان
هەر چوار وەرزی ساڵ ئەکەینە بەهار
جیهان پڕ ئەکەین لە گوڵو گوڵزار



● کاکی نووسەر کریم جمیل لە دهۆکەوە :
پارچە شیعرێکی بۆ ناردووین لە ژێر سەر دێری « هێلین وەلات » وا بە سوپاسەوە ئەم چەند دێرەی لێ دەکەینە دیاری بۆ

خوێنەرانی گۆڤارەکەمان :

کەلی هەڤالو گوندینا
ئەمین نێرگزێت بادینا
بەهارو جوانی پەرێسین
ئاشقێت ڤان زەر بەبیینا
کەوو سیسکێن ل سەرێت چیاێکەڤینێت بەفرێنیە ل هاڤینا

●●●●●

● هەڵبەستێکی ترمان لە کاك « رزگار اسماعیل » هوە بۆ هاتووە ، بە ناونیشانی « تروسکایی ئەستێرەکان » ، وا ئەم بەشەی خوارەوەی لێ بڵاو دەکەینەوە :

تروسکایی ئەستێرەکان
لە تاریکی شەوان
زەردە خەنەی سەر رووی ئاسمانن
ماتگ دەزگیرانی شەوە
پێش دوا هەنگاوی خۆر
جوانیی خۆی دەر ئەخات
دارستان و چەم و رووبارەکان
زووانی دلدارانی راستەقینەن

●●●●●

● بو کاك لقمان یاسین لە دهۆکەوە :

زۆر سوپاست دەکەین ، هیوادارین بەرهەمی چاکترمان بۆ بنێری و زیاتریش بەرهەمی شاعیرە ناسراوەکانی کورد بخوێنیتەوە و خۆتی پێ رۆشنبیر بکەیت و ، خۆشحالیشین کە ئەم چەند دێرەمان لە شعیرەکەت هەڵبژاردو وا بڵاوی دەکەینەوە !

هۆ تورینێ
هزر نەکە کۆڤانێت من ژبەر تەنە
هزر نەکە هۆزانێت من ؛
هەمی ل سەر بێ سووزیا تەنە
هزر نەکە ؛
تو چووی ژینا من تاری بوو
رووبارێ ژینێ شێلی بوو
نە تورنیێ .. نێ وەنینە

●●●●●

● دوا نامەی بەشی ئەمجارمیشمان کە وەلامی دەدەینەوە نامەی کاك « مظفر سلیمان شریف » ە ، کە هەڵبەستێکی بۆ ناردووین لە ژێرسەردێری « حەزێکی شێت » وا بە سوپاسەوە ئەو دوو کۆپلەیەی لێ بڵاو دەکەینەوە و هیواداریشین برای ئازیزمان لە بەرهەمی داهاتووی خۆیدا بێ بەشمان نەکات و نووسینی بەتام و بوێترمان بۆ بنێرێ ، تا ئێمەیش بیکەین بە جوانترین دیاری گۆڤارەکەمان « گۆڤاری کاروان » ، کاروانی هەموو نووسەرو ئەدیب و ئەدەب دۆستێکی کورد کە بە پەرۆشەوە مەبەستیانە ئەدەب و رۆشنبیری کوردی گەشە پێ بدەن و هەمیشە هەر لە برەودا بێت ، ئەمەیش دوو کۆپلە شیعرەکەی کاك « مظفر » ە و بەسوپاسەوە پێشکەشی « خوێنەرانی ئازیزی دەکەین :

« حەزێکی شێت »

خۆشم دەوێی
بەقەد حەزی هەموو عاشقان خۆشم دەوێی
ئەی ، ئەومنی ! لەگەڵ خوێنما تێکەڵ بووی و
بە دەماری عیشقی لەشم هەڵدەکەرێی

●●●●●

لەومتەی من تۆم خۆش دەوێ
ڤلات لە گەردنما کۆتە
نە ساتێ لێی رزگار دەبم
نە بۆ زووانی پێی شاد دەبم

●●●●●

خوێنەرانی خۆشەویت لە کۆتایی ئەم بەشەی پۆستەی کاروان‌دا جوانترین چەپکە گوڵی رێزو دڵسۆزیمان دەکەینە دیاری بۆ هەموو ئەدیب و نووسەرو ئەدەب دۆستێکی کوردو هیوادارین هەمیشە بەرهەمی بەپێزو دەوڵەمەندمان بۆ بنێرن و لەو هاوکاریەیان لە گەڵماندا دوا نەکەون ؛ ئیتر تا لە بەشێکی تردا بەیەك دەگەینەوە هەر سەرفرازو شادومان بن و هەربژین .





کەمال رەئووف محەمەد

# عەلی باپیر ئاغای شاعیر

**هونەری رۆژنامەنووسیی رادیۆ « الصحافه الاذاعیــه » دەوری گەورەی هەیە بۆ پاراستنی هەر بەرهەمێکی ئەدەبیی‌و هونەریی‌و مێژوویی‌و هتد .. لە هەمووشی گرنگ‌تر لــە لای رادیۆ ئەو بابەتە دەشێ بە « دەنگێکی مێژوویی »و زیندوو . ئەم یادگارەو هاوتایشی کە زنجیرەیە دەبن ، لەو جۆرەیە کــە سەرچاوەیەکی راستە بۆ دەورکردنەوەو ناسینی چەند توێیەکی هۆش‌و بیرو چەند مەیدانێکی هەڵس‌و کەوتی شاعیرێ کـــــە شوێنی خۆی لە ئەدەبی کوردییدا هەیە ، بەتایبەت ـ ئــەو ـ مردووەو نایەتەوە زمان !**

**سەرەتا :**

بەنەخۆشیی 30–11–1974 ماڵئاوایی لە دونیای هەبوون کرد بەڵام لە کاروانی ژیان‌و کردەوەی رۆشن‌بیریدا لـــــەم مەیدانانەدا هەمیشە شوێنی دیارە :

شیعر * رۆژنامەنووسیی * وەرگێڕان * بڵاوکردنەوە .

**لە مەیدانی شیعردا : دوو دیوان شیعری خۆی چاپ‌کردووە :**

1 ـ دیاری شارەزوور : 1966 / سلێمانی ـ چاپخانەی ژین .

2 ـ باغی میر : 1968 / سلێمانی ـ چاپخانەی کامەران.

**لە مەیدانی رۆژنامەنووسییدا :**

1 ـ لە ناو سێ کەسی یەکەمی ـ ئێرەدا ـ(1) لە یەکـەم گۆڤاری کوردییدا[ بانگ کرد ـ 1914 ، بەغدا ] نووسـەر بووە.

2 ـ لە رۆژنامەی [ بانگ کردستان ـ 1922 سلێمانی] دا نووسـەر بووە .

3 ـ لە رۆژنامەی [ روژ کردستان ـ 1922 ، 1923 ، سلێمانی ] دا نووسەر بووە .

**لە مە مەیدانی وەرگێڕاندا :**

1 ـ لیلی ومجنون ـ 1950 / بەغدا ـ چاپخانەی مەعاریف.

2 ـ خورشیدی خاوەر ـ 1953 / کەرکووك ـ چاپخانەی تەرەقیی(2) .

3 ـ روستەم و زوراب ـ 1955 / کەرکووك ـ چاپخانەی تەرەقیی(3) .

4 ـ غەزەواتی محەمەد حەنیفە ـ 1956 / کەرکووك ـ چاپخانەی تەرەقیی .

5 ـ ئەمیر ئەرسەلان ـ 1956 / کەرکووك ـ چاپخانــەی تەرەقیی(4) .

6 ـ شیرین و خسرەو ـ 1957 / کەرکووك ـ چاپخانەی تەرەقیی(5) .

7 ـ رۆستەم و جیهانگیر ـ 1958 / کەرکووك ـ چاپخانەی تەرەقیی(6) .

8 ـ گیانی سەعدی ـ 1969 / سلێمانی ـ چاپخانەی کامەران(7) .

**له مەیدانی بلاو کردنەوەدا :**

1 ـ دیوانی محوی ـ 1922 / سلێمانی ـ چاپخانەی حکومەت .

2 ـ کلدەستەی شعرای هاو عصرم ـ 1939/ سلێمانی ـ چاپخانەی ژیان + « گولدەستەی شوعەرای هاو عەسرم ـ 1969 / سلێمانی ـ چاپخانەی کامەران » .

3 ـ دیوانی احمد مختار جاف ـ 1960 / سلێمانی ـ چاپخانەی کامەران .

4 ـ مەکری ژنان ـ 1970 / سلێمانی ـ چاپخانەی راپەرین(8) .

5 ـ شاعیرە ناو ون بووەکانی کورد ـ 1973/سلێمانی ـ چاپخانەی راپەرین .

* رۆمانی [ چۆن بووم بە خانەدان = مەسەلەی ویژدان/ بلاوکراوەی د. ئیحسان فوئاد : 1970 / بەغدا ـ چاپخانەی ئیرشاد . لاپەرە : 61 دەلێ : لە دەورو بەری سالانی 1927 ـ 1928 دا لە لایەن عەلی کەمال باپیرەوە نوسراوەتەوە(9) .

*وەکو لە دووایدا دەردەکەوێ شیعری بلاونەکراوەیشی هەیە ، تەنانەت دیوانیشی هەیەو ـ هێشتا ـ چاپ نەکراوون(10) .

**یادگارەکە(11)**

گفتوگۆیەکی رادیۆیی تێکرایی‌یە . پێشنیارو ئامادەکراوی خۆمە. بەماگنێتەفۆنی جۆری «ناگرا ـ خێرایی5ر7» خۆم تۆمارم کردووە . شوێن مالی خۆی‌بوو لە سلێمانییدا . کات سەعات چوواری پاش نیوەرۆژی 2ـ9ـ1971 بوو . پاش مۆنتاژکردن‌و رایی‌کردن ـ اخراج ـ کە خۆم سەرپەرشتیم کرد [ لە بەرنامەی رادیۆیی : شەوچەرەیەکی کوردەوارییی ـ کەمال رەئووف محەممەد ـ ماوەی : 37 .د. ] لە پاییزی سالی 1971 داو لە زستانی 1974 داو لە سالی 1976 دا لە رادیۆی ناوبراودا بلاوکراوەتەوە . هەتا ئێستا « ئەسلەکە » و « بەرنامەکەش» لە ئارشیفدا هەلگیراوون .

* لە 2ـ11ـ1972 شدا هەر لە مالیَ خۆی‌و لە سلێمانییدا گفتوگۆیەکی « 2 دەقیقەونیویی » فلیمێکی سینەمەیی تەلەفزیۆنم لەگەل تۆمارکرد . کامیرا «16ملمی بێ‌دەنگ بوو » . کامیرامان عەبباس خەلەف بوو . رووناکیی هەلگر « ناوی نایەتەوە یادم » . دەنگ تۆمارکردنیش ( لە کاتی وێنە گرتن‌و گفتوگۆدا ) خۆم لەسەر ماگنێتەفۆنی جۆری ناگرا ـ خێرایی 5ر7 تۆمارم دەکرد . .«شاعیریش هەلامەتی‌بوو» تا ئێستاش ئەو فلیمە بلاو نەکراوەتەوەو لە دەزگای تەلەفزیۆندا هەلگیراوەو دەنگەکەش نەخراوەتە سەر فلیمەکە ، لەو سالەوە کۆششم کرد کە کارەکە جێ‌بەجێ بکرێ بەلام یارمەتیم نەدرا . هەمان گفتوگۆ لە رادیۆی کوردیی بەغدادا بلاووم کردووەتەوە ، هەروەها لە رۆژنامەی ( هاوکاری : ژ ـ311ـ 1ـ4ـ1976 دا ) .

* ئەم یادگارەی لەبەر دەستە ، ئەمانەتێکەو بۆ ئەوەی نرخی خۆی نە دۆڕێنێ ئەوا چۆن قسەکراوە ، بەو دەم‌و دووەوە دەیخەنە روو بەبێ سەپاندنی رێنووسی ئەدەبیی باو . لە لایەکی ترەوە 5ر99٪ قسەکان وەکو خۆیان‌و ئەوی نە شیاوە بلاوبکرێتەوە چەند قسەیەکی کەمە لەسەر سالانی 1922 و شیعری سیاسیی کە ئەوانە لە ئەسلەکەدا ماوون لێ‌کۆلەرەکان نەدەستیان نەچووە . تێکرای ئەو چەند قسەیەش لە دەورو بەری یەك دوو دەقیقەدان . لە رووی ئامانەتیشەوە دەبێ بگوترێ کە کمال علی ، کوری شاعیر لە هەردوو دانیشتندا ئامادەبوو .

* بۆ دووبارە نەکرنەوەی ناوی شاعیرو خۆم ، بۆ نیشانە ( شاعیر ) بۆ شاعیرو ( ک. ر. م ) بۆ ناوی خۆم دادەنێم .

**گفتوگۆکە :**

( پاش پێشکەش‌کردنێکی رادیۆیی‌و هێنانەقسەی ) .

**شاعیر :**

ناووم ، عەلی کوری باپیر ئاغام . باپیر اغا کوری چراغە ، چراغ کوری جوامێرە کە رەگیسی عەشیرەتی سمایل عوزێریی بووە(12) ، لە قەدیمەوە . باوکم باپیرئاغا لە زەمانی عوسمانی‌یی زابتی تورک بووە . لەو زەمانەیا عەمری خوای کردووە وە خۆم لە تەئریخی [ هەزارو سێ سەدو پێنجی هیجری‌یا ] لەپێش وەفاتی کاکەحەمەدا ( = زاتی موبارەکی کاك احمدی شێخ/ ك. ر. م )(13) بە شەش مانگ هاتوومە دونیاوە وە کاکە حەمەد گرتوومی بەباوەشی‌یەوەو دۆعای بۆ نووسیووم .

**ک. ر. م :**

مامۆستا ئێستا عومرت چەند ئەبێ ؟

**شاعیر :**

عومرم هەشتاو شەشە .

**ک. ر. م :**

ئینشاللاە لەش ساغ ئەبیو لە خۆشیدا ئەبی .

**شاعیر :**

خوا نەکا ؛ توخوا دۆعای وام بۆ مەکە .

**ک. ر. م :**

مامۆستا پەیوەندیت بە شێخ مەحموودی(14) نەمریشەوە هەبووە ؟

**شاعیر :**

عەرزتەکەم کە کوڕ بووم عومرم شانزە بوو ، شیخ مەحمود لەلای عەیزەفەنیی وەسماناغا ئەیخوێن،لە خانۆکەی‌عەیزەفەنیی بەرامبەر مزگەفتی گەورە کە ئێستا بازاڕی شێخ ڕەووفی شێخ مەحمووە · بالەخانەیەکی بەرز بوو · شێخ مەحموو بوو،بەنە ( = بەندە ) بووم ، حەمەی ئەوڕەحماناغا بوو ، حەماغای کاکەیی بوو ، هەموو لەوێ ئەمانخوێن ، فەقەت شێخ مەحموو نزیکەی هەشت نۆ ساڵ لە من گەورەتر بوو(15) .

**ک. ر. م :**

بەلام لەگەلیا ژیاوی ؟

**شاعیر :**

زۆر ، زۆر ، بەڵێ .

**ک. ر. م :**

کەیو چۆنو بۆچی شیعرت ووتووەو ناوی یەکەم شعرت چی بووە ؟

**شاعیر :**

بەڵێ ؟ وەلالایی قوربان بەنە لە مزگەفتی شێخ ئەولای هەولێریی(16) ئەمخوێن ، بەرامبەر ماڵی عیزەت بەگ کە ئێستا پێی ئەڵێن : مزگەفتی دوو دەرگا . ناوی ئەو پیاوە گەورەیان کوێر کردەوە کە باوکی خەلیفەی مەولانا خالید بوو(17) وە خۆی عالم بوو ، لە فارسی‌یا ، لە عەرەبی‌یا ، لە هەموو زبانێکا. ئەرزتەکەم لە خزمەت ئەوا ئەمخوێن ، لەوێ کۆئەبوونەوە ، شاعیرەکان وەکو : بێخودو(18) زیوەرو(19) ئەم تاقمە . کۆ ئەبوونەوەو بەحسی شیعریان ئەکردو شێخ ئەحمەد موختاری کوڕیشی کە لەم ئاخیرا قازیی بوو(20) ، ئەویش هەر شاعیر بوو. منیش مەراقی شیعر گرتمی ، دەستم ئەکرد بە شیعر گوتن.

**ک. ر. م :**

بۆچی دەستت کرد بە شیعر ووتن ؟

**شاعیر :**

وەللاهی پێم خۆش بوو . قسەیەکی جووان بووە وە منیش کە عومرم گەیشتە شانزەو حەڤدە فێری عاشقێتی بووم ، کوردی‌یەکەی ئیتر ( بەدەم پێکەنینەوە ) کچی جووانم ئەدیی ، حەزم ئەکرد شیعری پیا بڵێم !

**ک. ر. م :**

ناوی یەکەمین شیعرت چی بووە ، ئەگەر پارچەیەکی بفەرمووی ؟

**شاعیر :**

( بەخاوی‌یەوە )

**شەهیدی(21) چاوی مەخووری دلارامێکی بێ باکم**
**موهەققەق نێرگسی شەهلا ئەبێ بڕوێ لەسەر خاکم**

غەزەلێکی وایە هەموویم لەبەر نی‌یە .

**ک. ر. م :**

ئەمەت لە ساڵی چەندا ووتووە ؟

**شاعیر :**

ئەوە ، تەقریبەن ، عومرم حەڤدەو هەژدە بووە .

**ك. ر. م :**

گومانی تیا نی‌یە لەمەڕ خۆتانو شیعرەکانتان هەندێ ـ تەقریض ـ نوسراوەتەوە وەکو نووسینەکەی مامۆستا رەفیق حیلمی(22) کە باسی خۆتو شیعرەکانتی بە ووردیی گێڕاوەتەوە . لام وایە خوێندەوارێش یا گوێگرێش کە شیعرەکانتان ئەبیستن هەر یەکەو بەجۆرێ لە تۆ تێ‌ئەگەن . جا ئەگەر رێ بفەرموون خۆتان بە دەمی خۆتان ئەوەمان بۆ بگێڕنەوە: سەرچاوەی شیعرەکانتان وە پەیامی شیعر ووتنتان لە چی‌یەوە بوو ، وە چۆن بووەو وە بە کورتیی شیعری چۆن چۆنیتان نووسیوەو بۆ وەهاتان نووسیوە ؟

**شاعیر :**

وەڵلاهی قوربان ، لە ئەووەڵەوە ، زەمانی تورك ( =تورکی عوسمانی / ك. ر. م ) وەتەنی‌یەت کەم بوو چونکە تورکەکان داگیریان کردبووین(23) بە شەق ، کەس نەیەوێرا قسەبکا .

فەقەت بەنە خەیالی وەتەنی‌یەتم هەر لەدڵا بوو . لە زەمانی عوسمانی‌یا جەمال بابانی(24) وەزیر لە حوقووق ( كلیةالحقوق/ ك. ر. م ) ئەیخوێن لە بەغا ، عومەر نەزمیش(25) لەوێ لە حوقووق ئەیخوێن ، ئەویش وەزیر بوو . بەنەش مەئمووری ئەوراقی گومرگی بەغا بووم ، مەئمووری ئەوراقی گومرگی بەغا بووم لە چایخانەی ئەلوەزیر لە مەیدان هەموو رۆژێ لەگەڵ جەمال بابان کۆئەبووینەوە ، جەمال بابان ئیمتیازی وەرگرت ، ناوی نا [ بانگی کورد ] بیست سەحیفەیەك ئەبوو(26) ، نیوەی بە کوردیی ، نیوەی بە تورکیی . لەو مەجەللەیا من لەگەڵیا هین بووم .. موحەڕیری بووم وە موخابیریشی بووم . سیاسیش بوو مەجەللەکە . ئەرزتەکەم بەینێ مامەوە ، شەش مانگ لەوێ، لەپاشا من کرام بە باشکاتبی گومرگی سلێمانی ، هاتمەوە ئێرە، هەر موخابەرەم لەگەڵ ئەکرد ، هەر بۆم ئەنارد . دەوامی کرد ، بەینێك ، لەپاشا کە ئەو بوو بە مەئموور [ واتە جەمال بابان / ك. ر. م ] وازی لێ‌هێنا . ئینجا زەمانی شێخ مەحمود کە ئینگلیزەکان هاتن ، نوسخەم لامابوو ، بەزۆر لێیان سەنم [ = سەندم / ك. ر. م ] و بردیان ، ووتیان ئەمە شتێکی تەئریخی‌یە . یەکەمین کوردیی کە نوسرا ئەوەبوو(27). ( واتە یەکەم گۆڤاری کوردیی ئێرە / ك. ر. م ) .

**ك. ر. م :**

مامۆستا پرسیارەکە وا بوو ، سەرچاوەی شیعرەکانتان و پەیامی شیعر ووتنتان لە چی‌یەوە بووەو چۆن بووە .

**شاعیر :**

قوربان پەیامی شیعر کوتنم ئەوەبوو ، یەکێکیان بە خوسووسیی حەزم لە شیعر کوتن زۆر ئەکرد ، چونکی ئەوان ، هەموو شاعیرەکان لەدەورم کۆئەبوونەوە لە مزگەفتەکە ، وە منیش ، تەبیعیی گەنج حەز لە کچی جووان و شتی جووان ئەکا ، منیش حەزم هەبوو .

**ك. ر. م :**

یانی یەکەم شت کە پاڵی پێوە نابوون دلداریی بوو ؟

**شاعیر :**

دلداریی بووە وە لە دووای ئەویش وەتەنیی بووە ، زۆر وەتەنیی بوو .

**ك. ر. م :**

باشە کامیان زۆر : وەتەنیی یان دلداریی ؟

**شاعیر :**

وەڵلاهی وەتەنی‌یەکەم زۆر لا مەتڵەب‌تر بوو ، وە لەسەر وەتەنیێ وام لێ‌هات .

**ك. ر. م :**

مامۆستای بەڕێز وەکو سەرنجمان داوە ، لە شیعرە دلداری‌یەکانتا کە ئێوە پێی ئەڵێن ـ غەزەل ـ هەروەها لە هەندێ بیرو باوەڕدا دەربارەی ژیانو پڕو پووچیی‌و فانی بوونی دونیا کە لێی دوواوون ، وا دەر ئەکەوێ کە شیعرو ئەدەبی‌یاتی بێگانە « ! » کاری تێ‌کردبن ، جا نازانم ئێوە لەمەڕ ئەمە ئەڵێن چی؟

**شاعیر :**

بەڵێ لە خزمەت شێخەوڵای هەولێری‌یا کە ساحێبی ئەو مزگەفتەی لای ماڵی‌عێزەت بەگ‌بوو [ = لە سلێمانییدا \ ك. ر. م ] [ گولستانو بوهستان ]و حافزم ( = حافظی

شیرازی / ک. ر. م ) بەمەعناوە ئەخوێن . مەراقی ئەو زمانە « ! » بووەو سەعدیی ( سەعدیی شیرازیی / ک. ر. م ) زۆر لەوە ئەدووێ . حافزیش زۆر لەوە ئەدووێ ، منیش زۆر ئەمزانی کە دونیا هیچەو پووچە !

**ک. ر. م :**

نموونەیەك لەو شیعرانەی کە بۆ هیچەو پووچیی لە لای حافزو سەعدیی ووتراوون ؟

**شاعیر :**

حافز خۆی کوتبێتی ؟

**ک. ر. م :**

بەڵێ .

**شاعیر :**

بەڵێ حافز ئەڵێ :

[من ملك بودم‌و فردوس برین جایم بود آدم آورد درین دیر خراب آبادم]من مەلایەکەت بووم‌و لە بەهەشتا جێگەم بوو بەهەشتی گەورە . ئادەم منی هێنایە ئەم وێرانەیە .

**ک. ر. م :**

مەخسەدی دونیایە ؟

**شاعیر :**

مەخسەدی دونیایە ؟

جەنابت بەرامبەر ئەوە شتێکت هەیە بە کوردیی؟ خۆت داتنابێ ؟

**شاعیر :**

ها ؟ .. هەمە ، ئەقەت نایەتە بیرم .. بەڵام کە ئەڵێ :

**گوێ لە نەغمەی سازی دڵ بگرە(30)**
**کەماڵی گوێ مەدە ئاوازەیی زیل‌و بەمی دونیا**

ئەوە مەخسەدم ئەوەیە پیاو پیاوی خوا بێ ، دڵی لای خوا بێ باشترە لەوەی گوێ لە تارو عوود بگرێ ( ؟ / ک. ر. م ) .

**ک. ر. م :**

مامۆستای بەڕێز وەکو بە قسەی خۆتاندا دیارە ، هاوچاخی شێخ مەحموودی نەمر بوون ، جا چ تاقە یادگارێکی شێخ مەحموودی نەمرتان لە دڵدا دەرناچێ ؟

**شاعیر :**

وەڵلاهی شێخ مەحموو پیاوێکی زۆر خۆش بوو ، بێ تەکەببور بوو ، وە پیاوێکی ئازاش بوو ، فەقەت زۆریش بێ تەکەببور بوو ، هەتا بەعزێ جار تەریقم ئەکردەوە ، ئەم‌ووت : قوربان خەڵك لایان وایە تۆ ، ئەگەر : جوێنت پێ بەن کافر ئەبن ، ئەگەر تفەنگ بتەقێنن ئەبن بە یەزید ( = یەزیدی کوڕی موعاویەیە / ک. ر. م ) . منیش ، خەڵك دەرهەقی من وا بێ ، منیش بەقەدەر تۆ ئازا ئەبم . ئەیفەرموو ، ڕازەکەی(=ڕاستەکەی / ک. ر. م ) . زۆرم خۆشەویست .

**ک. ر. م :**

مامۆستا هەر لە زەمانی شێخ مەحموودی نەمردا لە مەیدانی ڕۆژنامەگەرییدا ئیشتان کردبوو یا نا ؟ وە لە کوێ‌و چۆن ؟

**شاعیر :**

قوربان لەوەو پێش ڕۆژنامە نەبوو ، غەیری ئەوەی جەمال بابان ، لە زەمانی تورکەکان کە عەرزم کردن ، لەپاشا حاجی مستەفا پاشا(31) ، کە شێخ مەحموو گیرا ، بردیان بۆ هیندستان ، حاجی مستەفا پاشا لە ئینگلیزەکان ئیمتیازی جەریدەیەکی سەند ، ناوی نا [ ڕۆژی کوردستان ](32) کە ــ ئێستا ــ سەعید ناکام لە بەغدا دەری ئەکا . ئەو منی کرد بە موحەڕیری ، لەگەڵ حاجی مستەفا پاشا لەو جەریدەیا ئیشمان ئەکرد ، هەتا ماڵی ئێمە لای ماڵی عیزەت بەگی وەسمان پاشا بوو ، گوواستمیەوە بردمیە ماڵەکانی سەعیبە فەنی .

**ک. ر. م :**

چەند مانگ موحەڕیری بوویت ؟ لە ڕۆژی کوردستاندا ؟ ( ڕاستییەکەی : لە بانگی کوردستاندا / ک. ر. م ) .

**شاعیر :**

قوربان شەش مانگ(33) موحەڕیری بووم . ئیتر کە شێخ مەحموو کە هاتەوە لێك تێکدراین ( ؟ / ک. ر. م ) . مستەفا پاشا ڕای کرد لە دەست شێخ .. تەیارەو ئەمانە وە

سەندی‌یەوە یای ( = دای / ك. ر. م) بە شێخ نووری ، شێخ نووری شاعیر(34) . دوو مانگ بەدەست شێخ مەحموودەوە بوو ، ئەوێش لەبەر تەیارەو مەیارەو نەمانە .. یەکی‌کەوت .. منیش رام‌کرد لە تاو تەیارەو .. چووم بۆ بەغاو .. ( ئەم قسانەی سەبارەت رۆژی کوردستان ڕاستە کە چاپخانە گوواسترایەوە بۆ دێی : جاسەنە / ك. ر. م ) .

**ك. ر. م :**

( بۆ تاقی کردنەوەی وریایی ، لێم پرسی ) خۆی سالی چەند « رۆژی کوردستان » دەرچوو ؟ ( ڕاستی‌یەکەی بانگی کوردستان / ك. ر. م ) .

**شاعیر :**

( بەدەم بیرکردنەوە ) بیستو ... بیستو هین بوو... بیستو دوو .

**ك. ر. م :**

مامۆستا شیعرێکت دێتەوە بیرم ئەفەرمووی ؛

**سەرێ بۆ بەرزیی وەتەن نەکا دەرد**
**وەکو شێت نەبێ وێلی کەژو هەرد**
**خۆی نەکا تووشی زامی دارو بەرد**
**وەتەن دەرنەکا لە دەستی نامەرد**
**ئەو سەرە یاخوا جێگەی ژێر خاك بێ**
**بەردە بازی سەر ڕێی ناپاك بێ(35)**

ئەم شیعرەت لە دەمێکەوە هانی‌داووم ، وا ئەو رۆژەش هات ، ئەم پرسیارە بکەم : سەرنجم داوە کە شیعرە نیشتمانی‌یەکانت کەمترە لەچاو بابەتەکانی تردا ، ئەوە بۆچی ؟

**شاعیر :**

قوربان ئەمە کە کوتوومە نزیکەی چل سال ئەبێ وە شیعری نەتەوایەتیم زۆرە ، نەمەوێرا چاپی‌بکەم ، بۆیان چاپ نەئەکردم ، وە ئێستا هەمووم کۆکردۆتەوەو وا لە چاپخانە ( ؟ / ك. ر. م) خەریکم تەبعی ئەکەم . عەرزتەکەم ئەو .. حەتا روباعی‌یەتێکم ناردە بۆ شێخ مەحموو ، لە چل‌و پێنجدا(36) ( 1945 /ك.ر.م) شێخ مەحموو لە بەغا دەست‌بەسەر بوو ، کە ئەلێ‌ـ کردبوویشیان بە کارت لە ئێران ، براییم .. و ئەوان ناردبوویان بۆ ئێرە ، سەری دوو شەهیدەکەی تیابوو ، بەلکو بیستووتە ، ئەوەشم کوتبوو ، لە چل‌و پێنجا ئەوەم کوتووە ..

**ك. ر. م :**

لەوروباعی‌یەتا ئەفەرمووی چی ؟

( بەدەم بیرکردنەوەیەکی قوولەوە / ك. ر. م ).. ئەم.. ئەمم .. جەژنی کەسێ‌موبارەکە ــ جەژن بوو ، جەژنە پیرۆزەم نووسی بۆ شێخ مەحموو ، ئەو بۆی نووسیبووم‌و من جووابم دایەوە :

**جەژنی کەسێ موبارەکە سەربەستو حور بژی(37)**
**پابەندی دەستی غەیری نەبێ ، چەشنی کوڕ بژی**
**کوردی هەژار ، ئەسیری دەستی غەیری ، جەژنی چی**
**کە جەژنی تۆیە ، بگری برۆ ، سەر بە فوڕ بژی .**

**ك. ر. م :**

ئەمە جووابی .. ( قسەی پێ بڕیم )

**شاعیر :**

من بۆ شێخ مەحموودم نووسیوە ، جا شێخ مەحموو ، کوتیان ئەگریا ، ئەیووت : ئەم کافرە هەر ئەمگرێنێ . دەنگی خۆش بوو ، کوتیان : ئەیخوێنەوە بە گۆرانیی .

**ك. ر. م :**

مامۆستای بەڕێز ئەگەر ڕێی پچووکت بدەی سەرنجێ لە شیعرەکانت ئەدەمەوە .. لە قەسیدەیەکدا ئەفەرمووی :

**شکور ئینسانم ئەصلەن حەز بە ئازاری بەشەر ناکەم**
**زەرەر نادەم لەکەس خۆم تووشی فیتنەو دەردی سەر ناکەم**
**لەتووانامایە دایم هاودەمی دێوو شەیاطین بم(38)**
**بەلام مومکین نی‌یە ساتێ رەفیقی‌ی پیاوی کەر ناکەم .**

لە لایەکی ترەوە ئەلێ‌ی :

**جیهان ئاشە ، زەمین‌و ئاسمانیش هەردوو بەرداشە**
**ئەمانهاڕێ بە وێنەی‌دانەوێلە ئاخری‌ی ئەم ئاشە**

لە لایەکی ترا ئەلێ‌ی :

**بەراستی‌ی مالی دونیاو پارە بۆ دونیاوو دین باشە**
**مەحالە ، دیارە ئاشارێتەوە شەوقی چرا فانۆس .**

ئەشفەرمووی :

**ژیان هیچە هەمووی دەردی سەری‌و ئەندووهی سەودایە(39)**
**ئەگەر ئیسراحەتو خۆشیت ئەوێ ئەی کاکە ! لەولایە**

**نەخۆی تەفرە بە وەعدەی هیچو پووچی تۆ دەخیلت بم**
**نیهایەت نەتکوژێ ئەم پیرە زاڵەی ناوی دونیایە**
**بەزمی دونیا سەیرە هێندێ کونجی مەیخانەی ئەوێ**
**ساقیو جامی شەرابی نابو پەیمانەی ئەوێ**

ئەشلێی :

**بیناغەی دەهری دوون رووخاوە یەکسەر تیکچووە ناشی**
**بەجارێ تێکشکاوەو ووردو خاشە بەردو بەرداشی**

لە پارچەیەکیشدا کە لە کتێبەکەی مامۆستا رەفیق حیلمیدا هاتووە ، ئەفەرمووی :

**ئەگەر ئەهلی سەماعی(40) گوێ لە نەغمەی سازی دڵ بگرە**
**( کەمالی )ی گوێ مەدە ئاوازەیی زیلو بەمی دونیا**

ئینجا مامۆستای بەڕێز ، لێرەدا دوو پرسیارتان لێ ئەکەین ، یەکەم : جارێ لەو چەند نموونەیەدا هەست ئەکەم کە تۆ بەردەوام لە دوو دڵییەکا ژیابووی ، دوودڵییەك کە هەمیشەهاتوویتە سەر راستە رێیەك کە ئەویش هیچو پووچی بوونو نەبوونە ، نازانم جەنابتان رای چییە بەرامبەر ئەملێکدانەوەیە ؟

**شاعیر :**

وەللاهی قوربان بە ننە ، لام وایە ، دونیا ئەساسەن هەموو کەس ئەزانێ دونیا هیچە ، بۆ کەس نامێنێ ، لاکین پارەکە بشبێ باشترە ، بۆ بەعزێ شت . من نەخۆش بکەووم پارەم بێ ئەمباتە لەندەن ئەداویم ئەکا ، نێئەگەی ؟ بۆ ئەومەسلەحەتە.

**ك. ر. م :**

بەلام جەنابت سوور لەوە دڵنیای کە دونیا هیچو پووچە.

**شاعیر :**

هیچو پووچە !

**ك. ر. م :**

بە هەموو شێوەیەکی ؟

**شاعیر :**

بە هەموو شێوەیەکی .

**ك. ر. م :**

ئەی ئەوە دونیا ؟

**شاعیر :**

ئێستا خەفەت ناخۆم من بمرم ، بمێنم ، ( بەجۆشەوە/ ك. ر. م ) وەللاهی بەقەدەر یەك زەڕڕە لە مردن ناترسم .

**ك. ر. م :**

ئەی ئەوە دونیا ؟

**شاعیر :**

ئەوە دونیا ؟ کورە خودا غەفوورون رەحیمە ، کەیفی خۆیەتی . سەعدی ئەفەرمووێ :

**چنان گفت سلامی بخوان کرم**
**عزازیل گوید نصیبی برم(41)**

خودای تەعالا سفرەی کەرەمی خۆی وا ڕاخستووە شەیتان ئەڵێ بەشی منیشی تیایە .

**ك. ر. م :**

دووەم شت لەمەڕ ئەو باسانەی کران ئەوەیە کە تاقە کەسێك کە لەسەر ئەو لێکدانەوەیەش بە وریایی سەرنجی دابێ ، مامۆستا رەفیق حیلمی‌ی ئەمرە کە لە سەرتان هەڵیداوەتیو وتوویەتی ! ئەم پارچەیەی ( کەمالی )ی کە جۆرە پەندێکی فەلسەفیی تیایە بەلامانەوە جوانە . بەلام نە مامۆستای ناوبراوو نە کەسی تر ئەو فەلسەفەیەیان روون نەکردووەتەوە ، ئەمجا ئایا : فەلسەفەکەت فەلسەفەی ئەهلی سەماعو لاهووتە (42) یان فەلسەفەیەکی ترە ؟

**شاعیر :**

فەلسەفەی ئەهلی سەماعو لاهووتە . یەعنی ئینسان خودا بناسی لەسەر هیچ شتێ پەکی ناکەوێ وە بۆ قیامەتیش خودا بناسە روو سوور ئەبێ ، بۆ دونیاش هەروا .

**ك. ر. م :**

باشە لە فەلسەفەی ئەهلی سەماعو لاهووتا ئەوە هەیە کە دونیا هیچو پووچەو الخ ..

**شاعیر :**

بەڵێ . بەڵێ هەیە . ئەوانەی کە خودا بناسن دونیا

بەلاوە تورەهاتێکە ، هەزار دە هەزار دینار .. هیچە ..

**ک. ر. م :**

باشە دیراسەی فەلسەفەی ئەوەتکردووە ، مامۆستا ؟

**شاعیر :**

بەلێە ؟

**ک. ر. م :**

دیراسەت کردووە ؟

**شاعیر :**

بەلێ. شێخ نەجمەددینی بیارە(43) ، لە حەربی عالەمیی ئەووەلا کردمیان بە کاتبی . کوتیان خوشکی شێخ نەجمەددین ژنی خەزوورتە ، خەزوورم شێخ عارفی خانەقا بوو(44) ، کوتیان خوشکی شێخ نەجمەددین ژنی خەزوورتە ئەبێ تۆ بچی ببی بە کاتبی ، ئەو تورکیی نازانێ ، چوومە خزمەتی ، دیراسەم کرد ، ئەزانم چۆن بوو ، تێگەیشتم دونیا چۆنە ، ئەو تێئەگەیی .

**ک. ر. م :**

باشە مامۆستا ، هەر لێرا ئەپرسم ، ئەڵێم : ڕات چی‌یە تا لەم تەمەنا بەرامبەر ژیانو دلداریی‌و پیری‌یەتی‌و مردن ؟

**شاعیر :**

وەڵلا قوربان لە مردن ناترسم ، چونکە مەعین ، خووا ، عەرزو حالم نەیا خەلقی‌کردووم ، وەئەرزو حالیش نایەم بمکوژێ ، کەیفی خۆیەتی ، کەیفی خۆیەتی . وە لەپاش ئەوەش لە مردن ناترسم ، چونکە خووا بەڕەحمە کەس نی‌یە گوناهی نەکردبێ ، حەزرەتی یەعقووب پیغمبەر بوو ، کوڕەکانی یوسفیان لەبەر تەماع خستە بیرەکە ، تێئەگەی ، دونیا ئەوەیە .

**ک. ر. م :**

ئەی مامۆستا ژیانو دلداریی‌و پیری‌یەتی ؟

**شاعیر :**

وەڵلا پیری‌یەتی ، قوربان ، خۆشە !

**ک. ر. م :**

( بەسەرسامی‌یەوە ) خۆشە ؟

**شاعیر :**

( بەئارەزوووەوە ) بۆ ئیمرۆ خۆشە !

**ک. ر. م :**

بەڵێــە ؟

**شاعیر :**

چوکین دونیای رووتە(45) !

**ک. ر. م :**

ئەی ژیان خۆی ؟

**شاعیر :**

ژیانیش ناخۆش نی‌یە . کەس حەز لە مردن ناکا .

**ک. ر. م :**

ئەی مەسەلەی دلداریی ؟

**شاعیر :**

دل هەر ئەمێنێ . ئێستا من حەز لە بەعزێ شت ئەکەم.

**ک. ر. م :**

وەکو چی ؟

**شاعیر :**

وەکو ئەوەی کچێکی جووان بێتە لام ، چاووم لێی بێ ، حەزگەکەم .

**ک. ر. م :**

بەڵێ بەڵێ .

**شاعیر :**

مەلا قادری بیارە(46) کە هەموو عولەمای کوردستان ئەفتیی ئەو بوون ، بەنەی زۆر خۆشەویست ، ئەیووت : بمخەنە ژوورێکەوە پڕ بێ لە پارە، عومرم هەشتایە، ئەیفەرموو، مال و منالم سێ رۆژ نان نەخۆن ، ئەتووانم دەستەبەم ڤرانی هەڵنەگرم(47) ..

**ک. ر. م :**

مامۆستا ئەگەر رێی پچووکت بدەی ، دلداریت کردووە؟ چەند جار ؟

**شاعیر :**

( بەجۆشەوە ) زۆر .

**ک. ر. م :**

له هیچیانا سەرکەوتی ؟

**شاعیر :**

وەللا سەرکەوتنەکە ئەوە بوو ، نەچووم دەرگاکەم ماچ ئەکرد . خۆ کەس کچی نەئەدی .

( بەپێکەنینەوە ) دەرگاکەم ماچ ئەکرد کە دەستی ، لە گەلقەرێزەکە کەوتووە .

**ک. ر. م :**

ئەمە چ سالێ بووە ؟

**شاعیر :**

بەخووا سالی .. چووزانم ، عومرم بیست بوو .

**ک. ر. م :**

باشە غەیری ئەوە ؟

**شاعیر :**

ها ؟ وەللا قوربان کەس کچی نەئەدی ، کەس چاوی پێ نەئەکەووت ، هەموو پەچەو عەبا بوو .

**ک. ر. م :**

مامۆستای بەرێز ئەگەر رێی پچووکت بدەی ، لێت بپرسم ، ناخۆشترین ساتی ژیانت چی بووە ؟

**شاعیر :**

قوربان ناخۆشترین ژیانم حەربی عالەمیی یەکەم بوو ، کرام بەعەسکەر ، پانزە سەر خێزانمان بەسەرەوە بوو ، لاکین خووا کارێکی بۆ کردم ، کردمیان بە کاتبی عەماری ئەرزاق . مزگەوتەکەی بەر هەلاجەکان ئەوە قەلەممان بوو تا ئەچێتەوە مالی عێزەت بەگی وەسمان پاشا ، ئەو خانووانە هەمووی هێن بوو .. عەمبار بوو ، گەنم ، رۆن ، برنج .. ئەمانە . مەلاش فتوای بۆ یابووین ، زۆر ئیسلام بوون ، مەلاش فتوای بۆ یابووین ئەوەندە بلێن منالەکان لەبرسا نەمرێ ، بەوە ئیدارەمان ئەکرد ، هەتا حەرب تەواو بوو ، ئەگینا رۆژی دوو کولێرە هەبوو ، زۆر ناخۆش بوو ، ئەو چووار ساله لەلام .

**ک. ر. م :**

مامۆستا نازانم شیعری بلاونەکراوەت هەیە یانا وە دووا شیعرت کامەیە ؟

**شاعیر :**

بەخووا شیعری بلاونەکراوەم لێرایە ( ئیمای بۆ تاقێ کرد / ک. ر. م ) هەندێ شیعرم نووسیوەتەوانێ . ئەلێم.. شیعرێکی سەعدیی هەیە تەرجەمەم کردووە .

**ک. ر. م :**

بەلێ .

**شاعیر :**

ئاخیر شیعرم ئەوەیە ، ئەلێ :

**جەزای خراپە بە خراپە دان**
**وەک ئاو خوواردنەوە سەهلە بۆ ئینسان**
**هەرکەس خراپەی کە لەگەلێ کردی**
**چاکەی لەگەلێ کە تۆ ئەگەر مەردی .**

ئەوە ئاخیر شیعرمە .

**ک. ر. م :**

تۆ ئەمەت تەرجەمەکردووە ، بەلام هی خۆت ؟

**شاعیر :**

ئەلێ ( واتە شاعیر خۆی / ک . ر . م ) .

**ئەی دار جگەرە زۆر زویرم لێت**
**ئەم قەدرە چیە خووا داویە پێت**
**داییم ماچ ئەکەی لێوی دولبەرم**
**تۆ تالعداریو من ئاخر شەرم**

ئەوە ئاخیر شیعرمە .

**ک. ر. م :**

مامۆستا تاوەکو ئێستا چەند شتت چاپکردووە ؟ دیوانو تەرجەمەو ئەمانە ؟

**شاعیر :**

قوربان : دیوان [ دیاریی شارەزوورو باخی میرو رۆحی سەعدیی ] ، یەکێ کەشم بەدەستەوەیە کە خەریکە چاپی ئەکەم. ئەمە سێ . [ شیرینو خوسرەو هی : جامیی ] موختەسەرێکە تەرجەمەم کردووە . زۆر دوورو درێژە . [ ئەمیر ئەرسەلان ]. بوو ، نەثر ( = پەخشان / ک. ر. م ) بوو کردوومە بە

شیعری کوردیی . ئەوەشت رەنگە بیستبێ ئەمە پێنج . بەعزێ کتێبی وردە وردەش وەکو [ خورشیدی خاوەر ]و عەرزتەکەم ئەمەشم کردووە وەکو [ رۆستەم‌و جیهانگیر ] لە هەورامیەوە گۆڕیم ، ئەوانە هیچ ئەهمیەتیان نیە .

**ك. ر. م :**

مامۆستا لە پارچەیەکتا ئەفەرمووی :

**بەشەو گوێ بگرە تالەو گوریە گوریی دڵ بە مەحزوونیی**
**بەسۆزی عەشقی جازانە ، عەجەب (شۆڕ)و (قەتار)(48) یکە**

**بەما-وادەرنەکەوێ کە زۆر حەزت بە مەقامی‌کوردیی هەیە ، لێرا ئەپرسم ، ئایا ئەو شیعرانەتان کە مامۆستا عەلی مەردان وتوونی جووانو چاکی وتوونو حەز بە کامیان‌ئەکەیت پێشکەشتی بکەین ؟**

**شاعیر :**

شۆڕو قەتار ، جارجار هین ئەیڵێ .. عەلی مەردان ، من ئەگرییم .

**ك. ر. م :**

ئەگرییت ؟

**شاعیر :**

ئەگرییم ؟ هەبا شەوێ عەلی مەردان هاتە لام لە کەرکوک ( خێرا قسەکەی گۆڕیی / ك. ر. م ) لە بەغا تا رۆژ لام بوو ، تا سەعات یەکو دوو لام بوو ، بەعزێکی بۆ کوتم ، وای لێ‌کردم ، ئەگریام .

**ك. ر. م :**

مامۆستا ئەو شیعرانەی مامۆستا عەلی مەردان کە وتوونی‌و هی جەنابتان ، بە مەقام وتوونی ، جووانو چاکی وتوون ؟ وە حەز بەکامیان ئەکەیت پێشکەشتی بکەین ؟

**شاعیر :**

وەڵلاهی عەلی مەردان .. بەعزێ شت زۆر بە غەڵەت ئەخوێنێتەوە چونکە نەخوێندەوارە ، وە خوێشی بە خەتی خۆی نەینووسێتەوە نایزانێ ، خۆم ئەو غەزەلەم لا جووانە کە ئەڵێ :

**بە فلسێ نامەوێ مەحبووبەیە دڵ سافو خۆش رووبێ**
**پیاوی ئەو دولبەرەم من ، حیلەبازو تونو جادوو(49) بێ**

**دەخیلم وێنەگر کاتێ ئەکێشی شکڵی ئەو شۆخە**
**کەمێ وریا بە ، شێوەی چاوی مەستی ، با خەوالوو بێ**

**ك. ر. م :**

ئەمە مامۆستا عەلی مەردان وتوویەتی ؟

**شاعیر :**

ئەڵێن ئەیخوێنێتەوە(50) . وە حەقتا کوتیان ، عەلی مەردان پێی کوتم ، کوتی پارەشیان بۆ داناوی بۆ ئەم غەزەلە ، لە ئیزاعەدا .. ئیتر نازانم ..!؟

**ك. ر. م :**

( ووتم ئەگەر ئەو غەزەلەم‌لەناو شریتەکاندا دۆزیەوە پێشکەشتی ئەکەم ، ئەگەر نا ، شتێکی تر ئەفەرمووی کە هەر هی تۆ بێ‌و بە دەنگی ئەو پێشکەشتی ئەکەم ، کەچی ئەو دیاربوو لە قسەکەم تێ نەگەیشتو ئەمەی بۆ گێرامەوە کە ووتی : ئەمەم لا خۆشە .. ) .

**شاعیر :**

**لە شاخو کێوی دەردو مەینەتا فەرهادی بێ حالم**
**لە دەشتو چۆڵو هەردەی وەحشەتا مەجنوونی عەووالم**
**خەریکی مەشقی ئەشق‌و خوێنێنی دەرسی خەتو خالم**
**لە هەشتا تێپەڕیم‌و وا ئەزانن پیرو داماووم .**
**لەسایەی عەشقەوە وا تازە مەشغوولی گرو کالم**

**ك. ر. م :**

مامۆستا لە کۆتایی دانیشتنەکەمانا زۆر زۆر سوپاست ئەکەم وە پێش ئەمەش پرسیارێکم هەیە ، ئەو بەرهەمانەی کە ئێستا لەچاپی بدەی چی‌و چین ؟

**شاعیر :**

یەکێکیان دیوانی خۆمە کە شیعری چاپ نەکراوە ، زۆربەی وەتەنیە ، مەسەلا ئەڵێ :

**ئاخری تەئسیر ئەکا هاوارو ئۆفو ئاخی کورد**
**مەڵهەمێ ئەگرێ زامی جەرگی پڕ برینو داخی کورد**
**بێشەیی شێری ژیانەو دامەنی بەفرو پلنگ**
**چۆن ئەژێ ... لەسەر ئاسۆی بلندی شاخی کورد**

**ك. ر. م :**

زۆر زۆر سوپاسی مامۆستا .

## پەراوێزەکان

«١» : ئەو سێ کەسە یەکەمە ، وەکو لە گفتاری شاعیر خۆیدا دێتە پێشەوە ، ئەمانەن : جەمال بابان ، عەلی باپیرئاغا ، عومەر نەزمی . باسی تریش لە پەراوێزەکانی ئاییندەدا روون دەبێتەوە .

«٢» : لە زمانی فارسی یەوە بەهۆنراوەو بەدەستکاری یەوە وەریگێراوەتە سەر کوردیی .

«٣» : لە هەورامی یەوە بە هۆنراوەو بە دەستکاری یەوە وەریگێراوەتە سەر شێوەی کورمانجیی خوارو .

«٤» : داستانێکە بە پەخشان نوسراوەو بەهۆنراوەو لە زمانی فارسی یەوە وەریگێراوەتە سەر کوردیی .

«٥» : لە زمانی فارسی یەوە بە دەستکاری و هۆنراوەوە وەریگێراوەتە سەرکوردیی .

«٦» : لە زمانی فارسی یەوە بە هۆنراوەو دەستکاری یەوە وەریگێراوەتە سەر کوردیی .

«٧» : لە زمانی فارسی یەوە کە هەندێ هەڵبژاردەیە لە گوڵستانی سەعدی شیرازیی ، بە هۆنراوە وەریگێراوەتە سەر کوردیی .

«٨» : چەند کورتە چیرۆکێکی کۆمەڵایەتیی بێگانە و خۆماڵی یە ، کۆکراوەن .

«٩» : گفتار لەم بارەیەوە ـ تۆمار ـ نەکرا ، بەلام بەدەمەوەو بۆی گێڕامەوە کە خۆی : دۆست و هاورێی نزیکی ئەحمەد موختار جاف بووەو خۆی بۆی نوسیوەتەوە ... زیاتر ووتی : ئەو کەسەی کە

چیرۆکەکەی لەسەر نوسراوەتەوەو مەبەستە ( ئاشکرایە :... ؟ ) و بە ئەحمەد موختار جافم ووت : باوکم من ئیتر بۆت نانووسمەوە ! ووتی : بۆچی ؟ . ووتم : ئەترسم لەسەر ئەم چیرۆکە بتکوژن . [ ئاشکراشە ئەو چیرۆکە کۆتایی پێ نەهاتووە . / ك. ر. م. ] .

«١٠» : بۆ مێژوو ، بۆ راستیی پەنجە هەڵدەبڕین و دەڵێین : دیوانی تەواوی ئەم شاعیرە دیارە ، لە لایەن هیچ دەزگایەکەوە چاپ نەکراوە ، ئەگەر چی وەچەکانی کۆیان کردووەتەوەو ئامادەیشیان کردووە .. بۆچی ؟؟؟

«١١» : بۆ مێژوو دەبێ ئەم باسانە بگێڕمەوە کە لەو گفتارەدا هەرگیز نەدەشیا تۆمار یان پاش تۆمارکردن ، بلاّ وبکرێتەوە : رادیۆی کوردیی بەغدا لەپاش ساڵی ١٩٦٨ ەوە زیاتر دەرگای بۆ ئەدەب و هونەرو پیاوانی ئەو مەیدانانە کرایەوە ، بەلام تەنها پشت دەبەسترا بە کوردەکانی دانیشتووی بەغدا . لەو ساڵەشەوە ، گەرمتر لە هەر کاتێکی تر [ لە ساڵی ١٩٦٦ ] ەوە بەندە لە لای کاربەدەستە گەورەکانی راگەیاندن و رادیۆو تەلەفزیۆن ، باسی ئەوەم کرد کە ئەگەر ئەم رادیۆیە پێش بخرێ ، دەبێ سەرچاوە تەماشا بکا کە سەرچاوەش ئەدیب و هونەرمەندانی ناوچەی کوردستانە . یەکێ لەو زاتانەش کە ئاگاداری ئەم باسەیە ، د . زەکی ئەلجابرە ، هەروەها محەمەد سەعید سەححاف کە زانستانەو بەهەستێکی رادیۆناسی یەوە تەماشای باسەکانمی کرد کە ئەم بەرێوەبەری گشتیی رادیۆو تەلەفزیون بوو .. مانگی حوزەیرانی ١٩٧١ چوومە لای ئەم زاتەو پێشنیارم کرد کە هەرچەندە من بەکرێی مانگانەیەکی ٣٠ دیناریی کاردەکەم بەلام تکام وایە رێگام بدرێ « ٢ » مانگێ بچم بۆ کوردستان و شریت و ماگنێتەفۆنم بدرێتێ تا چەند بتوانم بۆ یەکەم جار لەو سەرچاوەیەوە کارێکی رادیۆیی رابهێنم . سەرەتا ووتی : بۆ مانگێ ، بەلام

دوواجار تکای گرتم و له ١ /٧ / ١٩٧١ ەوە کەوتمە ریگا بۆ سلێمانی و هەولێر .. بەبێ ئەوەی من ـ مووەززەف ـ بەو مانی قەرزو قوڵەیەکی رەسمیم هەبێ ، بەڵکو کەلوپەلی ماڵی خۆم بۆ مەبەستی ئەم کارەم ، خستە رەهنی بانقەوە ، ئەمجا ماڵیشم گوواستەوە بۆ سلێمانی و لەوێدا ، مندالەکانم دووردەخستەوەو دەکەوتمە تۆمارکردنی دەنگو بەرهەمی ئەدیبو هونەرمەندو رۆشنبیرو مێژوونووسان ، یان بە رۆژو بە شەو بە دەزگای تۆمارکردنەوە دەچوومە ماڵیان ، تەنانەت لەناو ئوتومبیلدا . لە هەولێریشدا ، هەروەها ، بەڵام لەوێدا ئیشم کەمتر پێ کراو موخابن کە مامۆستا ( گیوی موکریانی ) ی چەند جار تکای نەگرتم ئەگەرچی ـ کوردستانی ـ کچی لە ژوورێکی گەرمی نیقابەی مامۆستایانی هەولێردا ، وە عەبدوللا پەشێوی شاعیر لە ژووری ئوتێلدا ، بۆ گفتارو تۆمارکردنی دەنگیان ئامادەبوون . راستیش بێ دیدەنی یەکەم بۆ هەولێر کەمتر بوو .

دێمەوە سەر چۆنی یەتی دیدەنیی کردنی [ عەلی باپیر ئاغا ] هەر کەییشتمە سلێمانیی ( کەمال ) ی کوڕیم ئاگادارکرد کە بەرنامەم تۆمارکردنی گفتوگۆیە لەگەل باوکی . ئەویش ئاگاداری کردم کە لە بەغدایەو هەتا مانگی ٩ / ١٩٧١ ، نایەتەوەو لەوانەشە بێتەوە . خووا کردی رۆژی ٣٠ / آب / ١٩٧١ ئاگاداری کردم کە لەوانەیە لەم یەك دوو رۆژەدا بێتەوە . ئەمە لە هەلێکدا کە دەبوو من ١ / ٩ / ١٩٧١ بگەرێمەوە بۆ بەغدا. بەڵام من پێم بەجەرگی خۆمدا ناو چاوەنووارییم کرد تا رۆژی ٢ / ٩ / ١٩٧١ لەگەل کەمالی کوڕیدا بە دیداری شادبووم .... موخابن کامێرای فۆتۆگرافم پێ نەبوو . ماگنێتەفۆن و چەند شریتێ کەرەستەم بوون . چوونە خزمەتی ، روو خۆش بوو ، چوونەکەمی پێ جووان بوو . ( کەمال ) ی کوڕی بەنازەوە چەند قسەیەکی خۆشی بۆ کردو هانی دا کە دڵی بکاتەوەو چی دەزانێ بیگێڕێتەوە ؛

لەسەر قەنەفەیەکی بەرگ قەدیفەی سوور دانیشتم ، مێزێکی گچکەلە کەماگنێتەفۆنەکەی لەسەر بوو لە نێوانماندابوو . سەرەتا خۆمم پێشکەش کرد کە کێم و کێ نیم .. بەڵام هەر ووتم کورەزای [ مەلا محەمەدی مۆر هەڵکەنم ] قورگی پڕبوو لە گریان ، دڵی ناسکی بۆ رۆژگاری جاران هاتە سوێ ، تەنانەت ووتی : هەتا ماوەیە لەمەوبەر بەو قەڵەمە جووانەی ـ باپیری من ـ . مۆرێکی ئەوی لا مابوو کە بەتایبەتی ناوی لێ هەڵکەندبوو تەنانەت قسەیەکی زۆر بە سۆزی کردو چوونی ـ منی ـ بە زیارەتێکی باپیرم ژمارد .

( کەمال ) ی کوڕی ، هەروەها خۆم ئاگادارمان کرد کە چەند پرسیارێکم ئامادەکردووە کە وەکو سەرەقەڵەمە ، ووتی : بۆم بخوێنەوە ! هەر بەپەلە چیم نووسیی بوو بۆم گێڕایەوە ، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە لەوەو پێش ئەو پرسیارانەی نە دیی بوو ، بۆیەکە دەڵێم لە کاتی گفتار تۆمارکردندا ، سات بەسات هەستم بە زەین روونیی قسە ئەستەقیی و وریایی دەکرد کە هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم وابێ ئەگەرچی ـ کەمێ ـ گوێ گرانیی پێوە دیار بوو . سەرئەنجام هەتا گفتارەکە تۆمارکرا ، چەند بەتام بوو ، وەکو کارمەندێکی رادێو ، بڕیارم دا کە گفتارەکە شێوەی سەرپێی ـ إرتجالی ـ ی پەسەندی لێدەرچووە ، جگە لەوە کە یەکەم گفتارێکی رادێویی بوو لەگەل ئەو ، لەرووی پاکیی تۆمارەوە بەنرخ بوو . دەشبێ ئەوە بڵێم ئەم تۆمارەکە ـ مێژوویی یە ـ وکارێکی رادێویی یە ، دەبوو لێرەدا بۆ ـ خوێندەواران ـ ئاسان بکرێ و باس و ناوی کەسان روون بکرێنەوەو پەراوێزو لێکدانەوە دروست ببێ کە ئەمە ـ دیارە ـ لە کاری رادێییدا ناشێ .

«١٢» : پەلێکی عەشیرەتی جافە / بنووارە [ تاریخ السلیمانیة وانحاءها ـ وضعه باللغة الکردیة : محمد امین زکی . نقله الی العربیه : محمد جمیل بندی الروژبیانی ـ ١٩٥١ / بغداد ]

«١٣» :الحاج الشیخ کمال احمد کوڕی شیخ مەعروفی نۆدێهی یە لە ساڵی : ١٢٠٧ ه = ١٧٩٣ م لە

شاری سلێمانیدا هاتووەتە دنیاوەو پەروەردەی خوێندەواریی باوکی بووە . لە زانستەکانی ( تەفسیرو حەدیس و فیقها ) دەستێکی بالای هەبووە . لە زوهدو تەقوادا ، کەم کەس خۆی لە شانی داوە . فەزڵی لە هەموو ئاسۆیەکدا هەتا لە هیندوستاندا دەنگی داوەتەوە . لە تەفسیرو حەدیس و فیقها نزیکەی ١٢٠ نامەی بە زمانی فارسی هەبووە کە لە ساڵی ١٢٢٩ هـ لە بەغدادا « ٦ » نامەی بە بچووکیی لەچاپ دراو ئەمجا لە یەك جلدا «١٢» نامەی لە ساڵی ١٣٥٥ هـ لە شاری نەجەفدا لەچاپ درا . هەروەها بە عارەبییش بەرهەمی هەبووە . لەوانە : شەرحی لەسەر مەنزوومەی باوی ( سلم الوصول في علم الاصول ) و پەراوێزی نووسراوی لەسەرکتێبی ( کمال ) في شرح ( الشافية ) في علم الصرف .

خووا لێ‌خۆش‌بوو لە تەمەنی ٩٨ ساڵیدا لە ١٣٠٥ هـ = ١٨٨٧ م کۆچی دوایی کردووەو لە ژوورەکەی خۆیدا نێژراوە کە لەو ساوە ئەو شوێنە مەزارێکی پیرۆزە . / بۆ ئەم زانینانە کە لە عەرەبییەوە کردوومانە بە کوردیی ، بۆ زانینی زیاتریش بنووارە ئەم دوو سەرچاوەیە : [ تأريخ السليمانية وانحاءها ... هەروەها کتێبی : الشيخ معروف النودهي البرزنجي ـ تأليف : محمد الخال / ١٩٦١ مطبعة التمدن ] .

«١٤» : شێخ مەحموود کوڕی شێخ سعید کوڕی شێخ محمد کوڕی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی حاجی شێخ مارف نۆدێ کوڕی سەید محەمەدی کبریتە سوور کە پشتاوپشت ئەچێتەوە سەر سەید عیسای بەرزنجی کوڕی سەید بابا علی همدانی .

شێخ مەحمود لە ساڵی ١٢٩٨ ك ( ١٨٨١ ) لە سلێمانیدا هاتۆتە دنیاوە . ١ / ١١/ ١٩١٨ ڕۆژی حوکمدارێتی‌یە ، ٩ / ٦/ ١٩١٩ ئینگلیز دای بەدادگایەکی عورفی سوپایی‌وکە فرمانی خنکاندنی لە ڕۆژی ٢٥ / ٧/ ٩١٩ بەسەردا درا ، بەلام لەجیاتی ئەوە بە یەخسیریی نێررا بۆ هندستان‌و فرمانەکە نەهێنرایە دیی . لە ١٢ / ٥/ ١٩٣١ دا حکومەتی عیراق ناردیە ( سماوە ) دووای ئەوە ( ناصریە ) . لەپاشدا لە ساڵی ١٩٣٣ دا هێنرایە بەغداو لەوێ زۆر بەڕێزەوە دانشیت ، تا لە شۆڕشەکەی ڕەشید عالی گەیلانی‌دا لە مایسی ١٩٤١ دا ، ئەمیش بەهەلی زانی ، بەغدای بەجێهێشت ، چووە دێیەکەی خۆی لە ناحیەی بازیان ، دێی ( داریکەلی ) . لەوێ دانیشت‌و ژیانی ڕابوارد تا لە ئەنجامی نەخۆشیدا ، لە بەغدا لە نەخۆشخانەی ( حیدری ) دووای ژیانێکی پاکی پڕ لە خەبات‌و تێکۆشان لەڕێی نەتەوەکەی‌داوجەنگاندن دژی عوسمانی‌و ئنگلیزی داگیرکەر ، دووای دوو جار فرمانی خنکاندنی دەرچوو جارێك لەلایەن عوسمانیەکانەوە جارێك لەلایەن ئنگلیزەوە ، لە ڕۆژی ٩ / ١٠/١٩٥٦ فرمانی یەزدانی بەجێ‌هێنا . لە مزگەوتی گەورە لای حاجی کاك ئەحمەدی باپیرە گەورەیەوە شاردرایەوە / بنووارە : [ هەندێك داوەریی بەناوبانگ ـ یاخود محاکمات ی مەزن لە مێژوودا ـ پارێزەر جمال بابان : چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق . بەغدا /١٩٨١ ] .

«١٥» : بەلێکدانەوەی لەدایکبوونی شاعیر ، دیارە شێخ مەحموودی ئەمر حەوت ساڵ لەو گەورەتر بووە .

«١٦» : شێخ عبدالله کوڕی شێخ احمدی هەولێری‌یە ( بنووارە : [ دیوانی بێخود ـ کۆکردنەوەو ڕێکخستن‌و لەسەرنووسینی محمدی مەلا کەریم / ١٩٧٠ بەغدا ) . هەروەها لە [ تأريخ السليمانية وانحاءها ـ لاپەڕە : ٢٠٥ دا هاتووەکە شێخ عبدالله الاربلی لە ساڵی ١٣٢١ ڕۆمیدا خۆی دامەزرێنەری قوتابخانەکەی بووە کە ژمارەی قوتابیانی چواردە کەس بووە ] . هەروەها [ التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية ـ بقلم محمد القزلجي / ١٩٣٨ مطبعة النجاح ـ بغداد : لاپەڕە : ٤٧ ناوی مزگەوتەکان‌و قوتابخانەکانی کەرەکی دەرگەزێنی سلیمانیی دەهێنێ‌و لە شەشەم ناودا دەلێ : مسجد الشيخ عبدالله الاربلي ـ کان رحمه الله من خلفاء مولانا

